PDF 4 KURD

رۆمان

د. نەوال ئەلسەعداوی

# دوو ئافرەت لە ئافرەتێکدا

وەرگیڕانی لە عەرەبییەوە
جیڤارا کەمال



پێشکەش ...

بە هەموو کچ وکوڕێك لە بەهاری تەمەنیان ، بە هیوای ئەوەی پێشوەخت هەست بەوە بکەن کە ڕێگەی خۆشەویستی بەگوڵ و گوڵزار دانەپۆشـراوە ، و ئەو خونچـانەی لە تیشـکی خـۆردا دەکـرێنەوە بۆیەکەمینجار دەمـی مژۆکـی هەنگەکـانی دەکەوێـتە سـەر تـا هەڵاڵە و پەڕە ناسکەکانی بمژێت ، گەر گوڵاڵەکان خۆیاندا بەدەستەوە ئەوا لەناو دەچن ، گەر بەرهەڵستیشیان کرد و پەڕە ناسك و جوانەکانی گۆڕی بە دڕکێکی تیژی زۆر ، دەتوانێت لەنێو هەنگە برسیەکاندا بژی ...

نەوال سەعداوی
مارسی 1975

ڕۆژی چوارەم بوو ، مانگی یانزە بوو ، پێی ڕاستی خستبووە سەر میزە تەختەكە ، و پێی چەپێشی لەسەر زەوی . وەستانیك كە هەرگیز لە وەستانی ئافرەتیكی نەدەكرد ( ئەو هیشتا لە چاوی كۆمەڵگەدا نەبووە بە ژن ) بەڵكو كچیكی تەمەن هەژدە ساڵان بوو . جلوبەرگی ئەو سەردەمەی كچان ڕێگەی ئەوەی نەدەدا كە كچان بەو شیوەیە پیوەی بوەستن . ئەوكات ئەوان شتێكیان لەبەردەكرد پێی دەوترا ( جیب ) توند لە رانەكانەوە دەئاڵا و تەسك دەبوەوە لە ئەژنۆكاندا ، وایدەكرد بەردەوام قاچەكان جووتبن لە كاتەكانی دانیشتن و بەپیوە وەستانیش ، تەنانەت لەكاتی ڕۆیشتنیشدا ، قاچەكان هەرگیز لیك دورنەدەكەوتنەوە لەكاتی ری ڕۆیشتنی ئاسایی مرۆڤەكاندا ، بەڵكو جوڵەیەكی بازنەیی بەردەوامی سەیر بوو ، كە جوڵەی پیكانی كچانی دەگواستەوە لەسەر زەوی و قاچەكان بە جووتی و ئەژنۆكان پیكەوە نوسابوون بەردەوام وەك ئەوەی شتێكی لە نیوان رانەكانی هەڵگرتبیت و بترسیت بكەویتە خوارەوە .

ئەو ( لەگەڵ ئەوەی كە كچ بوو ) پێی سەیر بوو ، خوازیاری ئەوەبوو كە بزانیت ئەو شتە چیە كە كچ لێی دەكەویت گەربیت و قاچەكانی لیك دوربكەونەوە . بە تێڕوانینێكی ئاساییەوە بەردەوام چاوەكانی لەگەڕاندا بوون ، و سەرنجی جوڵەی كچانی ئەدا كە لە جوڵەی كرمی دەكرد .

روخساری جیاوازییەكی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ كچانی تردا ، ئەوەندە نەبیت كە پانتۆڵی لەبەردەكرد ، و قاچەكانی درێژ بوون ، ئێسكەكانی ریك بوون ، و ماسولكەكانی پتەو ئەتوانی تەقە لەزەوی بهینیت كاتێك بەریدا دەڕوات ، و قاچەكانی بە ئاسودەیی بجوڵینیت ، و بە متمانەوە لیكیان دوربخاتەوە . بەردەوام خۆی لە نیو كچاندا ئەبینیەوە ، لە خوێندنگەكانی كچان ، و لە پۆلی كچەكاندا ، ناوی لە لیستی كچاندا بوو ، بهیە شاهین ، كۆتایی ناوەكەی وەك بنیشت بە لیستی ناوەكانی كچانەوەی دەبەستێت .

لەبەرئەوەی كە مێشكی مرۆڤ دەستەوەستانە لە تێگەیشتنی ڕاستی شتەكان ، ئەو لای هەمووان بە بهیە شاهین ناوی دەركردبوو و ناسرابوو ، بەڵام ڕاستیەكانی هیچ كەس نەیدەزانی .

ئەوان پیان سەیر بوو كاتێك هەنگاوی دەنا ، و ماوەیەكی دیار هەیە لە نیوان ئەژنۆكانی . دەیبینین كە سەرنجی ئەو ماوەیە دەدەن ، بەڵام خۆی وا نیشاندەدا كە

نایانبینیت ، و بەردەوام دەبوو لە ڕۆیشتنی ئاسایی خۆی ، قاچەكانی دەجوڵێنێت و لیكیان جیا دەكاتەوە ، و بە هەر پێیەكی تەپەی لە زەوی هەڵدەستاند ، بە هیزیكی واوە پێی دادەگرت هەستی دەكرد كە بهیە شاهین نیە .

ئەو ڕۆژە تەمەنی بووە هەژدە ساڵ . وەستانیكی ئاسایی خۆی وەستابوو ( ناشاز لای هەموان ) پێی ڕاستی لەسەر میزەكەو پێی چەپێشی لەسەرزەوی . وەستانیك كە هیچ كچیك نەیدەتوانی لەوكاتەدا ئاوا بوەستیت ، تەنانەت كوڕانیش . چونكە پێویستی بە دوو قاچی تەواو پڕ متمانە و ماسولكەی نەرم و ریكی ئێسكەكانی بوو .

قاچەكانی زۆرینەی كچ و كوڕی ئەو سەردەمە خواروخیچ بوون بەهۆی ( بەدخۆراكی ) لە منداڵیدا و نەدەتوانرا قاچێك بەرزبكریتەوە بۆ سەر میز و ئەویتر لەسەر زەوی بمینیتەوە . هەموو ئەوەی كە دەتوانرا ئەنجام بدریت تەنها بەرزكردنەوەی قاچێك بوو بۆ سەر كوڕسی و شوینی نزمی دانیشتنی میزەكە .

ئەو زۆربەی كوڕەكانی ئەبینی بەو شێوازە دەوەستان ، كە وەستانیكی ئاساییە و تەنها بۆ كورِەكان ڕێگە پیدراوە .

تەنها كەس كە دەیتوانی قاچی بەرزبكاتەوە و بیخاتە سەر لێواری میزەكە دكتۆر علوی بوو مامۆستای ( توێكاری / تشریح ) . لە نیوانی میزەكانەوە بە چاكەت و عەینەكە سپیەكەیەوە هاتوچۆی ئەكرد و لە نزیكی هەر مێزێك بوەستایە بەهیواشی ئەو خوێندكارە پێی دادەگرت و بەهەردوو قاچەكانی كە خەریك بوو بە زەویەكەوە دەلچكا دەوەستا لە بەردەمیدا . بەڵام ئەو قاچی فریدەدا بۆبەرزی لە هەوادا ، بە متمانەوە لەسەر لێواری میزەكە دایدەنا ، و ڕاستەوخۆ لە نیوچاوی خوێندكارانی دەرِوانی ، بە دوو چاوی شینی بی تروكاندن .

كاتێك لە نزیكی میزەكەی دەوەستا قاچی دانەدەگرت . و كاتێكیش چاوە شینەكانی دەبرِیە چاوە ڕەشەكانی . دەیزانی كە ڕەنگی ڕەش پتەوترە لە ڕەنگی شین و بەتایبەتیش لە چاودا . ڕەش ڕەسەنترە ، ئەو رەگەكانی ڕِۆچوون بە ناخی زەویدا .

لە نیوان پەنجە سور هەڵگەڕاوەكانیدا گیرە كانزاییەكەی پیبوو ، دەیكرد بە ورگی لاشە كراوەكەدا ، یان قۆڵی ، یان قاچ ، یا سەر ، یان مل و گەردن ، و بە نوكە

تیـژەكەی شـتێكی ئەگـرت و بە دەنگێكــی تیـژ هــاواری دەكـرد : ئەمە چـیە ؟ بەردەوام هەرە شـتە ورد و ئالۆزەكـانی دەدۆزیـیەوە و دەیگـرت . مولـولەیەكی وردی ژێر ماسولكە ، دەماریكی تەنك كە لە پێستدا ون بووە ، هەستە دەماریكی ورد كە بە ئاستەم دەمی گیرەكە دەیگریت .
ئەوان هەشت كچ بوون لەدەوری لاشـەیەك . لەنیوانیاندا یەكێـک یان دوان نـاوی ئەو دەمـار و مولـولانەی لەبەربـوو . هەر ئەوەنـدە كە دكتـور علـوی دەیپرسـی : ئەمە چـیە ؟ دەنگێكــی تیــژی مێینەیــی لە هــۆڵی توێكــاری بە هیواشــی نــاوە راستەقینەكەی وەڵام دەدایەوە .
لە هەموو جارێكدا سەرنجی دەدا ، هەستی دەكرد كە وەڵامـی دەداتەوە ، تـا بۆی بســەلمیت كە وەڵامەكە دەزانیــت بە شـیوەیەك كە نەزانیـت كەسـێک ئیمتحــانی دەكات .
ئە ڕۆژە ، چـواری یـانزە بـوو ، هەسـتی دەكـرد كە شـتێكی ترسـناك لە ژیانیـدا ڕوودەدات . هەمــوو ســاڵیك لەو ڕۆژەدا ئەو هەســتە دەیگریــت . لە بەیانیانــدا چاوەكانی هەڵدەهینیت و ئەبینیت كە خۆر هەڵهاتوە و تیشـكێكی نائاسایی هەیە ، و چاوەكانی دایكیشی بریسكەكانی زیاترە ، بە هیواشـی لە ناخیدا بەخۆی دەڵێت : بەرِای من لە ڕۆژێكی وەك ئەمرِۆدا شتێكی ترسناك بەسەر دایكمدا هاتووە ، ئەو منــی بــووە . و لەهەر جارێكیشــدا هەســت دەكــات كە شــتێكی ترســناك ڕوودەدات لەو ڕۆژەدا ، ترسناكتر لە لەدایكبوونی .
كـاتێكیش ئەم ترسـە ئەچرپینیـت بە گـوێی دایكیـدا ، دایكـی پێكەنینێكـی شـاراوەی بێدەنگی ئەو سەردەمە دەیگریت كە وەك هەناسە دانەوەیەكی پچرپچرِە و ئەڵیت : عاقڵ بە بهیە .
دایكی تیی نەدەگەیشت . كاتێكیش دەیبینـی كە تەنیایە لەسـەر جیگەكە بە هیواشـی دەكشا بۆ لای و جیگاكەی باوكی دەگرت .
هەروەك جــاران دەســتە بچكۆلانەكــانی دەئاڵانــد لە گەردنە گەورەكەیەوە . ئەو تەواو وا هەسـتی دەكـرد كە تەنهـا جەسـتەی دایكـی لێـی تیـدەگات . قۆڵەكـانی دایكیشی تیوە دەئاڵا خەریك بوو ئەیپساند .
ئەو كاتە چیرۆكی مندالانەی ئەفسوناوی خەیاڵیەكانی ئەخوێندەوە . لە یەكێـک لەو چیرۆكـانەدا خوداوەنـدیكی ترسـناك هەبـوو كە خەڵكـی دەیانپەرسـت لە شـاریكی

سیحریدا . ئەم خوداوەندە توانای هەبوو بە دەستیکی هەر شتێکی رەق بگریت ، و پەستانی بخاتەسەر ، و دوای ئەوەی دەستی ئەکاتەوە بەتاڵە و هیچی تیادا نیە . لەبەردەم هیزی ئەم خوداوەندەدا ئەوکات بیزار دەبوو نەیدەزانی هۆکارەکەی چیە ، بەڵام دواتــر وردەوردە تیـــی گەیشـــت ، دواتـــر بـــۆی دەرکەوت کە هەر لە ســەرەتاوە تیــی گەیشــتوە ، لەو کــاتەی تێگەیشــت کە جەســتەیەکی جیــاواز لە جەستەی دایکی هەیە .

ئەو ســاتە لە مێشــکی دەرناچیــت . ئــازارەکەی لە ئــازاری چەقــۆی دەکــرد کە گۆشتاوگۆشت ئەبرِێت . لەگەڵ ئەوەشدا ئازاریکی ڕاستەقینە نەبوو . کاتێک دەستی بازنەیەکی تەواو بە دەوری جەستەیدا خولایەوە بازیکی هەڵدا لە هەوادا . وەك پاسارییەك لەخۆشیان بفرِێت .

بەڵام ئەو پاساری نەبـوو ، بەهـۆی ڕاکێشـانی زەویەوە کەوتە ســەرزەوی . لەو کەوتنە خوارەوەیەوە توانی کیشی جەستەی بزانیت . زانی کە لەو قورسترە . و زەوی بە هیزیکی زیاتر لە هیزی ئەو بۆخۆی ڕادەکێشێت . وەك قۆڵەکانی دایکی جارێکی تر بەهیز ڕایدەکێشێت . و بەهەموو توانای دەیەوێت جەستەیان بکاتە یەك ، بەبـــی هــودە ، و جیــابوونەوەی هەتــای لە ســاتە وەختیکــا روویــداوە و تیپەڕِیوە و ناگەریتەوە .

لە منداڵیەوە هەست بە نەهامەتی سەر جەستەی تایبەتی دەکات . لەگەڵ خۆی لەهەر هەنگاوێکــا هەڵیــدەگریت ، لە نیــو هەر خــانەیەکی لەشــیدا . هەســتیك و حەزیك بۆ گەڕانەوە بۆ ئەو شـوینەی لیوەی هـاتووە ، بۆ دەرچوون لە سنوری هیـزی ڕاکێشـانی زەوی ، بـوونی بە جەسـتەیەك کیشـی نەبیـت ، روو و سـنوری دەرەکی هەبیت جیای بکـاتەوە لە دەوروبەر . حەزیکـی زۆر بۆ تـوانەوە لە هەوادا ، و فەنا بوونی تەواوەتی و یەکجاری.

سـەرنجی وینـەی خوداوەنـدە ئەفسـوناویەکەی دەدا ، و لە پەنـجە گەورەکـانی ورد دەبـوەوە کە شـتەکانی بە پەسـتانیك ئەپسـاند ، کـاتێکیش کە شــەوانە بە ترســەوە خەبەری دەبـــوەوە بەرە و ناوجیگـــاکەی دایکـــی و بـــاوکی دەکشـــاو جەســـتە بچکۆلانەکەی ئەهاویشتە نیوان جەستەی رووت و بـی جلوبەرگی هەردووکیـان ، دەســت و قـۆڵە گەورەکـانی بـاوکی پاڵیـان پیـوە دەنـا و دوری دەخسـتەوە ، بەڵام

دایکی بە دوو چاوی ڕەشی وەك چاوەکانی خۆی لێی دەرِوانی و بە دەنگێکی پرِ سۆزەوە پێی دەوت بهیە بچۆرەوە نیو جیگاکەی خۆت تۆ تازە گەورە بویت .

دەنگی پرِ سۆز بوو ، وەك پەنجە نەرمەکانی سەر جەستەی هەستی بەو سۆزە دەکرد ، کە وەك ئەوە وابوو وینەی بکیشیت لە کەوندا . و بەتەنها لە جیگاکەیدا بەهۆی ئەو سۆزەوە دەگریا ، کە بە هیواشی بەسەر جەستەیدا دەگەرِیت و ئازادی و سەربەستی جەستەی ئەسەلمینیت ، و بەردەوام دەبوو لە گریانیکی بێدەنگ کە جیگاکەی دەلەراندەوە ، و حەزی دەکرد کە جولەی فێلاوی و درۆی ئەو پەنجانە کۆتایی پیبیت ، و بەهیزیکی زۆرەوە پەستانی بخاتە سەر ، بە یەکجاری کۆتایی پی بهینیت و جەستەی ئەو و دایکی بکاتە یەك .

چاوەکانی لیکنا تا بنویت بەڵام نەنوست . زۆر ئەترسیت لە بۆچونیك بەبیریدا هاتووە . ئەویش ئەوەیە کە هەموو ژیانی تەرخان بیت بۆ گەڕان بە دوای ئەو ساتەدا یان راکردن لێی . لەترسان سەری خستە ژیر بەتانیەکەوە ، ژورەکەی پرِ بوو بوو لە وینە و سیبەری خوداوەندە ئەفسوناوی و خەیاڵیەکان ، پەستان ئەخەنە سەر جەستەی تا لە ناوی بەرن و ئەویش بە هەموو توانایەوە هەوڵدەدات و بەرگری دەکات ، بە قاچی لێیاندەدات ، و بە ددانەکانی گازیان لیدەگریت ، و هاوار دەکات بۆ داواکردنی یارمەتی دایك و باوکی .

هاوارەکانی ترسیکی ڕاستەقینە نەبوو . فێڵ بوو ، فێڵی لە دایکی پی ئەکرد . ئەو فێڵەکان لەوەوە فیر دەبوو . دایکی درۆی لەگەڵ دەکرد . لە جیگاکەدا لەگەڵیدا دەنوست و پێی دەوت جیت ناهیڵم . بەڵام لە نیوەی شەودا هەستی دەکرد خۆی دەدزیەوە و دەچووە ژیر جیگاکەی باوکی . ئەویش تەواو وەك ئەوی دەکرد . دەیزانی بە چ هاواریکی بەزەیی ئامێز بکرِوزیتەوە تا دایکی ڕاپێچی لای خۆی بکات و لەگەڵ ئەودا بنویت .

دایکی لە مەبەست و حەزی نەدەگەیشت . دەمی پرِ دەکرد لە خواردن و هەر کە ئاوڕی دەدایەوە بەولادا تفی دەکردەوە ناو قاپەکە . پێی سەیر بوو کە چۆن دایکی نازانیت لە کاتێکدا وەك ئەو وابووە . جارێکیان لێی ئەپرسیت لە وەڵامدا

پێی ئەڵێت کە بیری نیە . پاشان بۆی دەرکەوت کە خەڵکی بیرەوەریە کۆنەکانیان بیر دەچیتەوە و بیری خۆیان پرِ ئەکەن لە شتانیك کە رووی نەدابیت .

بە منداڵیەکی بیگەردەوە بە دایکی وت کە ئەو بۆی دەرکەوتووە مێینەیە و نێرینە نیە ، و جلوبەرگەکەی لا دەدات تا ئەو ڕاستیەی بۆ بسەلمینیت .

بەڵام کیشای بە دەستیدا و هاواری کرد : عەیبە ! هیچ وەڵامی نەدایەوە و جارێکی تر لێیدا و وتی بڵی : نەمزانی .. تۆبە ! وەڵامی نەبوو . پاشان دەستی بەرزکردەوە و زللەیەکی لیدا . و دەمی نەکرایەوە تا بڵی نەمزانی و دوبارەی ناکەمەوە ، لەبەرئەوەی بیری کراوەتەوە بەرووی ڕاستیەکی سەیردا ، سەری داخست و لەژیر لیوەوە وتی خەڵکی تەنها حەزە ڕاستەقینەکان قەدەغە دەکەن ، لەبەرئەوەی پتەوە ، بەڵام حەزە ناڕاستەکان نا لەبەرئەوەی سستن یاسای قەدەغە کردن نایانگریتەوە . و دەستیکرد بە گەڕان بە چواردەوری خۆیدا بەدوای هەموو قەدەغە کراوەکان تا حەزە ڕاستەقینەکانی مرۆڤی بۆ دەرکەویت .

ئەوە گەڕانیکە لە پیناو ڕاستیەکاندا ، و لەمە زیاتر نیە . جگە لەمە هیچی تری نەدەویست . کاتێکیش کە دکتۆر علوی بە عەرەبانەکەوە لەبەردەم هۆڵی توێکاریەوە لە پەنجەرەکەوە حەوت بیلبیلە سەرنجی ئەدەن . تەنها بیلبیلەیەکی ڕەش کە جیگیرە لەسەر ئەو هەستە جیگیرە کە هەموو شتێکی ئاسایی و ڕێگە پیدراو ڕاستەقینە نیە و دورە لە ڕاستی . یەکێک لە هاوریکانی بە سەری پەنجە لەسەر شانی ئەدات و ئاگاداری دەکاتەوە : برِوانە ! و سەری بەرز دەکاتەوە بۆ پەنجەرەکە ، عەرەبانە درێژەکە ئەبینیت ، سەریکی لیوە هاتۆتە دەرەوە دوو چاوی شینی لاوازی پیوەیە و جارێکی تر بە سەری پەنجە لە شانی دەدات و پێی ئەڵێت :

- رات چیە بهیە ؟

- تێڕوانینەکەی ڕاستی نیە .

ئەکیشیت بە پشتیدا و ئەڵێت : داماو !

و هەر چوار دەمەکان پێکەنینێکی مێینەیی بێدەنگ و پچرِپچرِ دایان دەگریت ، وەك هەناسە لاوازەکان . لەو بیدەسەڵات و ترسەیان کە نەیاندەویرا بە ئاشکرا پیبکەنن زیاتر توڕە و نیگەران بوو وەك گاڵتەجاڕیەکەیان ، و خوێن گەیشتە دەم و چاوی ، و سەرجەم کەلوپەلی توێکارییەکەی کۆکردەوە و کردیە جانتا

چەرمەکەیەوە و هۆڵی توێکاری جیهیشت . کاتێک چووە دەرەوە و بەر هەوای کراوە کەوت ، و لە لوتیا بۆن و بەرامی فۆرمالین و لاشە مردوەکان نەما تێگەیشت کە ئەو نە بە گاڵتەجاڕییان و نە بە بیدەسەڵاتیان بیزار نەبوو ، بەڵکو ئەیویست ئەو هەستە بچرپینیت بەگوێی یەکێکدا کە ساڵیکە بە شاراوەیی ماوەتەوە ، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کۆئەبیتەوە ، هیندەیتر پتەو ئەبیت و ئەگاتە ترۆپك لە چوارەم ڕۆژی هەموو مانگیکی یانزەدا ، ئەو ڕاستیەی بۆ دەردەکەویت کە ئەو بهیە شاهین نیە .
لە کۆلیج هاتە دەرەوە و بە شەقامی ( قصر العینی ) بەریکەوت ، لە دەم و چاو و روخسارەکان ورد دەبوەوە وەك ئەوەی بیەویت روخساری ڕاستەقینەی خۆی لە نیوانیاندا بدۆزیتەوە . لە نزیکی ویستگەی پاسەکە وەستا ، بۆی دەرکەوت کە ئەو بەدوای هیچ شتێکدا نەدەگەڕا بەڵکو ماندوو و برسیە .
لە پاسەکەدا دانیشت پشتی بە پشتی پیاویکەوە بوو ، رووی لە رووی پیاویك ، لە لاکانی ڕاست و چەپی پاو بوون ، لەبەردەمیشیدا بەرِیز پیاوان بەبی دەنگی دانیشتوون ، بەشی خوارەوەی جەستەیان بە کورسیەکانەوە نوسابوو وەك بەرد ، بەشی سەرەوەی جەستەشیان بە هێمنی لەگەڵ جوڵەی پاسەکەدا ئەلەریەوە . کاتێکیش کە پاسەکە دەوەستا هەموو سەریان ئەچوەوە دواوە ، بەترسیکەوە چاویان دەکردەوە و پاش ئەوەی بۆیان دەردەکەوت کەسەریان لە جیگەی خۆی ماوە چاوەکانیان لیك دەنایەوە و دەنوستن .
سەرجەم فەرمانبەربوون ، لەبەرئەوەی شەقامی قصرالعینی بریتی بوو لە وەزارەتەکان و دیوانەکانی حکومەت . جەستەیان یەك شێوازی وەرگرتووە روخسار و جلوبەرگ و پێڵاو و پەنجەکانیان هەموو لە یەکتری دەچن وەك ئەوەی حکومەت چۆن پارە بە یەك شێواز و هەموو وەك یەك دروست دەکات ئەمانیشی ئاوا دروستکردووە . شانەکانیان جووت و بەیەکەوە نوساو . کەمێک نەرم وەك ئەوەی قورساییەکی بۆ هەتاییان لەسەر شان بیت و دیار نەبیت بەڵام بوونی هەبیت . بەڵگەش بۆ ئەوە ئەوەیە کە ناوەناوە شانیان دەجولاند وەك ئەوەی بیانەویت جیگای ئەو قورساییە ئاڵوگۆرِ بکەن .
لەگەڵ ئەوەشی کە نوستبوون بەڵام جوڵەی چاوەکانیان لەژیر پیڵوەکانەوە ئەوەی دەردەخست کە نوستنەکانیان ڕاستەقینە نیە ، کاتێکیش چاوەکانیان دەکەنەوە و

لێی ئەرِوانن ، بۆی دەردەکەویت کە بەئاگا بونەکانیشیان ڕاستەقینە نیە ، و وای لیدیت هەموو شتەکان لە دەوروبەریان دەبیتە ناڕاستەقینە . گەر لیوەکانیان بکریتەوە و ددانەکانیان دەرکەویت نازانیت ئاخۆ پیدەکەنن یا تورەبوون ، کاتێکیش دەستیان دەبینیت کاتێک سواری پاسەکە دەبن یان دینە خواری نازانیت ئاخۆ سلاو لەیەکتر دەکەن یان هەڕەشە . هەموو شتەکان تیایاندا ئالۆز و تیکەڵە ، شتە پیچەوانەکانیش وەك یەکن ، بۆ نمونە خەندە کردن وەك دەموچاو بەیەکدادان وایە ، و سلاو کردن وەك هەڕەشەیە ، ڕاستگۆییش وەك درۆیە ، و بەرائەتیش وەك گوناە باریە ، خۆشەویستیش وەك ڕق لیبونەوەیە . و ئەوەندە روخسار و جوڵەکان وەك یەکیان لیهاتووە هەست بە خنکان دەکەیت ، سەری لە پەنجەرەی پاسەکەوە دەباتە دەرەوە تا هەناسەیەکی قوڵ وەرگریت لەهەوای شەقامەکە .
کاتێکیش کە هەناسەی ئاسایی دەبیتەوە هەست بەو شیواندنە دەکات کە حکومەتەکان لە مرۆڤدا دروستی دەکەن ، لیرەدا پیاوی کامڵ ئەچیتە قەبارەی منداڵیکەوە ، بەڵام ئێسکی کەللەسەری تەمەنە ڕاستەقینەکەی دەردەخات ، قاتەکەی بەری و بۆینباغەکەی ئەوە پێشان دەدات کە لە ئاستی حکومیدایە ، و ری ڕۆیشتنەکەشی هەمان ئاماژە دەدات .
لە هەموو جیگەیەك دەیبینین ، شەقامەکانیان پرِ کردووە ، و پاسەکانیان لی لیوانلیوە ، لە دەرگاکانەوە دینە ناوەوە و دەچنە دەرەوە ، باڵەخانە و بیناکان ، بە جەستە بچوکەکانیانەوە ، شانە ئاوساوەکانیان بە قاتە گەورەکان و کەللەسەرە گەورەکان ، و پشتە کۆم و چەماوەکانیان ، و لیوە کراوەکانیان بە خەندە کە وەك تورەییە و یان تورەییە وەك خەندە وایە . بونەوەرانیکی لە مرۆڤن و مەسخ بونەتەوە ، بە هیزیکی گەورە ، هیزیکی بەدەر لە توانای مرۆڤ ، مرۆڤ بۆتە بونەوەرانیکی جگە لە مرۆڤ .
لە پاسەکە دابەزی و بەرەو ماڵەوە بەریکەوت . لە دورەوە پیاویکی وەك پیاوانی تری بەدیکرد دوو شانی فراوان و کەللەسەریکی گەورە و پشتێکی چەماوە . بی ئەوەی سەرنجی بداتی هەنگاوەکانی خێراکرد تا بچیتە ژوورەوە ، بەڵام بە ناوی خۆی بانگی کرد و ، کە ئاوڕی بۆ دایەوە بینی باوکیتی . لەوە دەچوو ترسیکی گەورەی بینیبیت لەسەر دەموچاوی و هەربۆیە بە سەرسورِمانەوە لێی پرسی :
- بهیە ئەوە چیتە ؟

چاوەكانی بە لەپی دەستەكانی شاردەوە و رایكرد .
هێشتا دەموچاوی نەهاتبوەوە سەرخۆی كە دایكی دەرگاكەی لێدەكاتەوە . بەڵام ئەو هەستی بەو تیكچونەی دەموچاوی نەكرد . چونكە بەردەوام وابوو ، بۆ ئافرەتێك قورسە تا بتوانێت ریژەی ئاڵۆزی روخسارەكان دیاری بكات ، ئەو كارە پێویستی بە سەرنجدان و قاڵبونەوە هەیە لەو بوارەدا. دایكیشی لەو جۆرە بوو كە نەیدەتوانی لە روخساری ورد ببیتەوە . چاوەكانی توانای ئەوەیان نەبوو بتوانێت لەسەر چاوەكانی بی تروكاندن بوەستن . هەر لەوەشەوە بەڵگەی ئەوەی بۆ دەركەوتبوو كە لە منداڵیەوە فێڵی لی دەكات . باوكیشی هەروەها فێڵی لیكردووە . لە ماڵەوە لەبەردەمیدا بە جەستەیەكی زەبەلاحەوە دەوەستا ، پشتێكی پتەو و دەست و لەپێكی گەورە و فراوان كە توانایەكی باشی هەبوو بۆ زللە لیدانی ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو تەنها یەكێكە لەو هەزاران فەرمانبەرەی حكومەت .
هەژدە مۆم داگیرساوە لەسەر میزە سپیەكە ، دایكیشی دەمی پر ِ دەكات لە شیرینی ، كاتێك رووی لی لائەدا تفی ئەكاتەوە ناو قاپەكە و باوكی كە ئەیبینی پیدەكەنیت ، بەڵام ئەو گومانی هەیە لەو پێكەنینە . سەرتاپا باوكی گومانی تیایە . گومان وەك مۆم وایە ڕەنگیكی سوری هەیە و پیوەدانیكی تیژیش وەك دەرزی ، ئێستاش ئەو پیوەدانە هەست پیدەكات لە پەنجەكانیدا و ، میزەكەش ئەو میزەیە ، بەڵام تەنها مۆمیكی لەسەر بوو . ئەوكات تەمەنی تەنها یەك ساڵ بوو ، ڕەنگی سوری مۆمەكە لە چاویا وەك پارچەیەك لێی وابوو . جەستە خشۆكە بچكۆلانەكەشی بەسەر زەویدا وەك پارچەیەك وابوو ، ئەو هێشتا لە كەون جیا نەبوو بوەوە ، دەستەكانی بە دەوری جەستەیا نەدەهاتەوە ، ئەو دەستەكانی بچكۆلانە و جەستەی گەورە ، كاتێك كە دەستەكانی دەبرد نەیدەزانی ئاخۆ ئەو قاچانە قاچەكانی خۆین یا قاچی كورسەكەیە ؟ كاتێكیش كە تیشكە سورەكەی بینی لە چاوەكانیدا نەیزانی كە ئایا ئەو تیشكە تیشكی چاوەكانیتی یا تیشكی مۆمەكەیە . كەوتە گومانەوە و ویستی دڵنابیت ، پەنجەی درێژكرد و ئاگرەكە پیوەیدا ، جیاوازی نیوان ئاگر و چاوی بۆ دەركەوت ، هەر لە روانگەی گومان و ئازارەوە جەستەی دەستیكرد بە گەشەو وەرگرتنی شێوازی خۆی .
لەسەر میزەكە گوێی لە دەنگی دایكی بوو ، لە نیوان هەژدە ئاگری بەرزی مۆمەكانەوە : هەموو ساڵێك بەخۆشی بهیە . سەری سورماو نەیزانی تەمەنی

گەیشتۆتە هەژدە ساڵان . ئایا كەون هەژدە ساڵ بەدەوری خۆیدا خولاوەتەوە ؟ نەیزانی چۆن ئەو پرسیارەی كرد ، بەڵام دەزوویەكی حەریری باریكی نەبینراو سورِی ئەو دەبەستێتەوە بە سورِی كەونەوە . كاتێك سەرنجی مانگی ئەدا لە نیوانیاندا ئەو دەزووە حەریریانە درێژ دەبوونەوە كە بەرەو لای یەكتری رایدەكیشان . بەڵام توانای ڕاكێشانی زەوی بەهیزترە ، ئەویش لەنیوانیاندا بێدەنگ ماوەتەوە ، بەڵام ناخی وەك گیژاوی دەریا قوڵپی ئەدا ، بەرگری ڕاكێشان ئەكات لە هەموو لایەكەوە ، و هەر لە ناخیدا شتێكی بچوكی وەك میزڵدان دەتەقیتەوە ، و هیلكەیەكی بچكۆلانەی لە قەبارەی دەرزییەكی دەبوسدا دیتە دەرەوە و لە سەریدا تەنها چاویك هەیە دەگەڕێت بەدوای بەیەكگەیشتنی هەتایی ، بۆئەوەی بەتەواوی لە كەوندا ون ببیت .

روخسار و دەم وچاوی سور بووبوو لە تیشكی مۆمەكەدا باوكی وا هەستیكرد كە شەرم ئەكات وەك هەموو كچانیكی تەمەن هەژدە ساڵان ، بەڵام ئەو لە هەژدەساڵیدا نەبوو ، كچیش نەبوو ، واتای كچ چیە ؟ ئەم پرسیارەی لە باوك و دایك و هاوریكانیشی كردووە لە هۆڵی توێكاری ، كاتێكیش كە دكتۆر علوی گوێی لەم پرسیارە دەبیت بە گیرە كانزاییەكە لە ورگی ئافرەتیكی سەر میزی توێكاری ( ڕەحم ) دەگریت . سیگۆشەیەكی گۆشتینی بچوك بەرگی دەرەوەی لوس و ناوەوەی گرنجگرنج و بنەوەی بۆ سەرەوەیە و سەرەكەشی بۆ خوارەوە . چاوە شینەكانی برِیە چاوە ڕەشەكانی و پیكەنی . بەڵام ئەو پینەكەنی . پاشان دەستی گرت و بردیە نزیك مێزێكی تری توێكاری كە لاشەی پیاویكی لەسەر بوو و بە زمانی پزیشكیانە پێی وت : بەڵام پیاو ئەمە . و بە نوكی گیرەكە كۆئەندامی نێرینەی پیاوەكەی گرت . پارچەیەك پێستی ڕەشی دەماراوی بینی .

كاتێك كە گەرِایەوە بۆ ماڵەوە لەبەردەم دایكیدا دانیشت و لە دەموچاوی ورد دەبوەوە و پاشان لێی پرسی : ئایا من بهیەم ؟ دایكیشی قاقایەكی بێدەنگی وەك جارانی كرد و وتی : عاقڵ بە كچم ! دایكی تیی نەدەگەیشت ، بەڵام ئەو لە دایكی دەگەیشت ، كاتێكیش كە بە وردی و بۆ ماوەیەكی زۆر لێی ورد دەبوەوە دەیتوانی ڕەحمی ببینیت ، بە چەماوەیی لە بنی ناو سكیدا دانراوە ، و هەست بە ماسولكەكانی دەكات خاودەبنەوە و دەچنەوە یەك ، لە كردەیەكی خێرادا ، وەك لیدان و كردەی كەون لە بێدەنگی شەودا ، بە جوڵەیەكی بێدەنگ و بی هەستی

وەك جوڵەی زەوی ، هەستی کرد دەیەویت بە هەموو توانای پەستان بخاتە سەر ئەو ڕەحمە تا لەو جوڵە خێرایە شیتانە نهێنییەی بخات ، و تا هەتایی بێدەنگ بیت ، بەڵام دایکی چاوی دادەگریت بۆ زەوی ، توانای ئەوەی نەبوو بۆ ماوەیەك لە چاوەکانی ورد بیتەوە ، لە ناخیدا شتێک هەیە لێی دەشاریتەوە ، خەفەی کردووە و چین بەچین دراوە بەسەریدا لە ناوەوە ، تاکو نەبینراو بیت ، و جوڵەی شاراوە و بی کۆتایی بیت بۆ هەتایی .

هەتایی وشەیەکە واتاکەی نازانیت ، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەرِِوات ، و سورِِی مانگ لەگەڵ سورِِی خوێنیدایە لە دەمارەکانیدا ، و خانە فودراوەکەی ناخیشی لە هەمان ساتە وەختدا دەتەقیتەوە ، و هیلکە ئاڵۆزەکەش بەدەوری خۆیدا دەخولیتەوە خولانەوەیەکی خێرای شیتانە وەك خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا ، و بە تیلەی چاویکی لە کەوندا بەدوای خودی خۆیدا دەگەڕێت ، بیهودە ، بیهودە هەمان نیگەرانی دوبارە دەبیتەوە هەموو جارێک ، وەك سورِِی مانگ ، و ڕق و تووڕەیی لەناخیدا کۆدەبیتەوە وەك گەرمی خوێن ، کۆدەبیتەوە و کۆمەڵە دەبەستیت و دەخولیتەوە لەگەڵ خولانەوەی زەمەن لە ناوەوەی بۆشایی جەستەیدا ، هەستی پیدەکات لە خانەکانیدا ، هەستیکی توندی پرِِ حەز ، پێی ئەڵیت کە ڕۆژێک لە ڕۆژان شتێکی ترسناکی لی روودەدات ، ڕۆژێکی دیاریکراو .

ئەو هەرگیز ڕۆژژمیری نەبوو ، و هەروەك سەیری ئەو ڕۆژژمیرەشی نەدەکرد کە باوکی لە ژوورەکەی خۆی هەڵیواسیوەو هەر ڕۆژەی پەرِِەیەکی لێدەکاتەوە . هەموو بەیانیەك و لە هەمان کاتداو بەهەمان هیز لێی دەکاتەوە . ڕایدەکێشێت و چرچ و لولی دەکات لەنیوان پەنجەکانیدا پێش ئەوەی بەسەریدا هاوار بکات و بۆ دوور فرِِیی دەدات و ئەڵیت : بەری بدە ! پێش ئەوەی باوکی دەستی لە کاغەزەکە ببیتەوە هەست دەکات کە هەڵەی کردووە ، و خۆر بە ریژەیەکی ئاسایی تیشکی نیە ، و چاوەکانی دایکی هەمان چاوەکانی ڕۆژانی ئاساییین ، و ئەو هەستە سەیرەی لای دروست بووە تەنها یەکێکە لەو چەندین خەیاڵ و داڵغانەی لە مێشکیدان . لادەکاتەوە و پشت لەباوکی ئەکات تا کاغەزەکە وەك ڕۆژان لی بکاتەوە ، بەڵام ئەو زۆری لی نەکرد ، و بیستی لە پشتیەوە کەسێک ئەڵیت : هەموو ساڵیك بەخۆشی بهیە ، بەخێراییەکی سەیر ملی وەردەگیریت ، و

چاوەكانی دەكەوێتە سەر ژمارە ( 4 ) چوار لەسەر كاغەزی ڕۆژژمێرەكە . و ڕەنگێك ئەهێنیت و ڕەنگێك ئەبات .
لەشەقامەكەدا هەر ئاوڕی بەملاولای خۆیدا دەدایەوە و كاتێک دەنگێک ئەبیستیت ئەوەستیت و ئاوڕ ئەداتەوە وەك ئەوەی كەسێک بانگی بكات . دواتر بۆی دەردەكەویت كە كەسێكی تر بانگ دەكریت ناوەكەی لە ناوەكەی ئەوەوە نزیكە ، وەك وەفیە یا علیە یان نجیە یا زكیە .
كاتێكیش سواری پاس دەبیت وا هەست دەكات كە كەسێک لەدوایەوە سواربووە ، دوایكەوتووە ، كاتێكیش لە شەقامی قصر العینی دەدادەبەزیت هەست دەكات گوێی لە دەنگی هەنگاوەكانیتی ، كاتێكیش دەچیتە ناو كۆلیج لە دەرگاكەوە ئەویش لەگەڵی دەچیتە ژوورەوە .
لە ڕیرِەوە قەرەباڵخەكانی ناو كۆلیج لێی ون دەبیت ، سەرجەم روخسار و دەموچاوەكان تیكەڵ دەبن ، هەست دەكات كە لە دەریایەكدا بە تەنها نوقم دەبیت . بێئەوەی كەس ببینێت ، و بێئەوەی كەس بتوانیت جیای بكاتەوە و دەموچاوی وەك دەموچاوی هاورِیكانی لیهاتووە و جیاوازی نەماوە لە نیوان بهیە و سوعاد و علیە و ئیفۆن ، لەم ساتە وەختەدا لە مانای تەواوی مردنی ڕاستەقینە تیدەگات . ئەو لە نیو لاشەكانی هۆڵی توێكاری بەدوای مردندا دەگەڕا .
مردن تەنها لە هەستە زیندوەكاندا دەژی ، ژیانیكی پتەو ، كە توانای وەرگرتن و گرتنی ئاستەم ترین هەستەكان و زۆر ترینیان شاراوە و نهێنی هەیە ، هەروەها هەستكردن بە ونبوون و فەنابوونی زەرِرِەكانی هەوا كە لە كەونەدا مەلە دەكەن و بەرگری ون بون دەكەن لەگەڵ ملیۆنان زەرِرِاتی تردا ، یان وەك ئەو دڵۆپە ئاوەی بەرگری دەكات لە توانەوە لەناو ئاوی دەریادا . بەرگریەكی شیتانەی بیهودە لەوپەرِی نەهامەتیدا ، كە دروستكەری خۆبەدەستەوەدانی هەتایی بەبێدەنگی . هەركەسێک لەو كاتەدا لە روخسار و دەموچاوی برِوانیت واهەست دەكات كە كەرِ و كویرە ، و جەستەی بی جوڵە ماوەتەوە ، لەگەڵ ئەوەی قاچەكانی لەسەر زەوی هاتوچۆیانە ، هەنگاو لە دوای هەنگاو ، و شتەكان لە پێش چاوی بەیەك ڕەنگ و یەك شیوە دەردەكەون ، و جەستەكان هەموو وەك یەكن ، و جوڵە و دەنگەكان وەك یەكن . خۆی دەبینیت بی ئاگایانە

دەگوزەریت ، یاخی لە تارمەی كۆلیج ، یاخی لە لیكچویی كوشندە ، لە ناوەوە و لە دەرەوە ، لە جەستەیدا و لە جیهانی دەرەوەش .
ئەو پەناگەیەكی بچكۆلانەی هەبوو لەو دیوی بینای كۆلیجەوە لەسەر كورسیەكی بی پاڵپشتی بچوك دادەنیشت ، دانیشتنەكەی وایدەكرد بەپێشا كەوتبیت ، لە جیگەیەكی بچوك لەو زەویەی بەردەمی كە هیندەی لەپی دەستیك دەبی ورد دەبیتەوە هیشتا گیای لی سەوز نەبووە ، جیاوازە لە زەویەكانی تری دەور وبەری و بە خۆڵی ماوەتەوە بی سەوزایی ، قڵیشاو ، لەنیوانی كەلینی ئەو قڵیشاویانەوە بە ملیۆنان لە بونەوەرانی ورد و ئاڵۆزی لە قەبارەی میرولەدا دین و دەچن .
- بهیە !
ئەم ناوەی خۆی وەك زەنگیك لە گوێیدا دەزرنگیتەوە وەك ناوی ئەو نەبیت ، و لەسەر كورسیەكە بە پرتاو هەڵدەسیت ، و لەو شۆرِشەی جەستەی بەرپای كردووە تیدەگات كە جەستەیەكی تایبەتی هەیە ، توانای جوڵاندن و لەراندنەوەی هەیە بێئەوەی جەستەكانی تر لەگەڵی بجوڵیت و ناویكی تایبەتیشی هەیە ، كاتێك لە هەوادا زەنگ لیدەدات سەری بەرز دەكاتەوە و لای سەرسورِمانە ، لەوانەیە بپرسیت : كی بانگم دەكات ؟ لەهەر جارێكدا كە بانگ دەكریت پێی سەیرە ، بەهەستیكی شاراوەوە ئەزانیت كە كەسێك بانگی دەكات ، و جەستەی لە نیوان ملیۆنان جەستەدا دەناسیتەوە ، و توانای ئەوەی هەیە كە لە نیوان بلیۆنەها لە بونەوەران كەلە كەوندا مەلە دەكەن بیدۆزیتەوە .
ڕەنگی دەموچاوی تیكچوبوو كاتێك سەیری ئاوینەی ژووری خوێندكارانی كرد، روخساری وەك روخساری ئەو پەیكەرانە دەهاتە پێش چاو كە خرابونە سەر میزی توێكاری ، كاتێكیش پەنجەكانی بەر جەستەی دەكەویت وەك كلۆ بەفر وابوو . ئەوكات زانی كە ترساوە و دەیەوێت هەڵبیت لەدەست ئەو دەنگەی بانگی دەكات ، لەو بانگكردنەی كە تەواو مەبەستی لەوە ، لەدەست ئەو هیزە لەبن نەهاتووەی توانی لە نیوان هەمووان دەستنیشانی بكات ، ویستی هەڵبیت .
بەخێراییەك كە پێشتر وانەرۆیشتبیت و خۆی كرد بە نیوان هاورِیكانی وایكرد جەستەی لە نیوان جەستەی ئەوان و سەر و روخساریشی لەنیو ئەواندا ون بیت ، كاتێك سەرەكان دەجولێن ئەویش سەری دەجولێنیت ، بۆ لای ڕاست یان چەپ و پێشەوە و دواوە ، وەك قەڵغانیك خۆیی پی دەپاراستن و هەروا‌ش بە شاراوەیی

مـایەوە ، نەیـدەتوانی سـەری بەریـتە دەرەوە ، لەبەرئەوەی لە دەرەوە هیزیکـی گەورە هەیە توانـای ئەوەی هەیە بە ئاسـانی لەنیـو ئـاپۆرِ ەدا دەریبهینیـت ، و جەستەی لەنیو جەستەکانی تر دەستنیشـان بکـات . هیزیکی بەتوانـای سـەیر ، هەر هینـدەی سـەری بەریـتە دەرەوە ڕاسـتەوخۆ وەك موگنـاتیس پتەوتـر لە هیـزی ڕاکێشانی زەوی بۆلای خۆیی ڕادەکێشێت و دەست دەکات بەخولانەوە بەدەوریدا وەك چـۆن شـاخە هەسـتیارەکانی هەنگیکـی شـیت لیبکەیـتەوە بەدەوری خۆیـدا دەخولیتەوە تا ئەو خولانەوەیە لەناوی دەبات .
ئەو هەسـتی بەو مەترسیە دەکـرد لە ناخیـدا گەشـە دەکـات و گەورە دەبیـت ، ئەو مەترسـیەی بەردەوام هەڕەشـەی ئەوەی لێـدەکات کە مەحـاڵە لەنـاوبراوە ، و ڤایرۆسـیك لەلەشـیدا دەژی ، لەسـەرخۆ و لەبەرەوە هەلیـدەکۆلیت و دەیخـوات بێئەوەی بەخـۆی بزانیـت ، یـاخود لە ناکـاو لەناودەچیت لەچاوتروکانیکدا لەژیـر سکەی شەمەندەفەریکدا ، یا لەنیوان تـایەی پاسـەکە ، و کەسیش بەفریـای ناگـات ، کاتێکیش گوییستی هاواریك دەبیت لەژیر سکەی شـەمەندەفەرەکەداو سـەر دەباتە دەرەوە جەستەیەك دەبینیت بوە بەژیرەوە وا هەست دەکات جەستەی ئەوە ، و ئەو روخسـارە تیکچـووە روخسـاری ئەوە ، ئەو خـوێنە سـورەی سـەر چیمەنتـۆکەش خـوێنی ئەوە . کـاتێکیش شـەمەندەفەرەکە دەسـت بەجـوڵە دەکـات و دەرِ ِوات هەست دەکات کە جەستەی لەشوینی خۆیەتی و بـی زیـان و یاسـاییە ، و خوێنیشـی هیشـتا لەنیـو دەمارەکـانیتی و دەرنەچـووە ، پاشـان بە هەسـتیکی شـاراوەوە دایـدەگریت ، بەڵام ڕاسـتیە ، کە هیشـتا ئەو ڕۆژە نەهـاتووە ، ئەو هیشـتا بهـیە شـاهینە ، خوێنـدکاری کۆلیجی پزیشـکی زیـرەك و سـەرکەوتوو ، نـاو و ناوبانـگ پاك ، کچی محمد شاهین بەرِ ِیوەبەر لە وەزارەتی تەندروستی .
بە هەمـان جـوڵەی ڕۆژانەوە ئەچیتە کۆلیج ، و ڕاسـتەوخۆ دەچیتە لای کورسیە پلیکانەکانی علی پاشا ئیبـراهیم و لەسـەر هەمـان کورسـی ڕۆژان دادەنیشیت . دوا کورسـی دوا ریـزی لای چەپ . هەرکەسێک بیبینێت واهەسـت دەکـات نوسـتووە لەسـەر کورسـیەکەی ، لەگەڵ ئەوەی بە ئاگـایە و زۆریـش بە وریـایی ، خوێندکارەکان زۆر بە ئاسایی و چاکی دەبینیت کە چۆن بەرەو دەرگـاکە دەرۆن ، و پـی بە قـاچی یەکتـردا دەنـین ، جانتـا پرِ ِو هەڵئاوسـاو لە کتێبەکـانی تـایبەت بە

توێكاری بە دەستیانەوە ، و عەینەكە سپیە ئەستورەكان لەسەر لوتەكان ئەلەرنەوە تـا نەكەونە خـوارەوە بەدەسـتـی چەپ گیـراون ، و دەسـتـەكەی تـریش واتە دەسـتـە ڕاسـتـەكان ڕێگـا دەكـاتـەوە و بەخێرایــی ئەیانەویـت بچـنە ریزەكـانی پێشــەوە ، و هەریەكێكیان كە ئەچیتە سەر ئەو كورسیەی دەیەوێت هەناسە برِكیی دیت ، و كەشــكۆلەكەی دەكــاتەوە بە پەنــجە ســور هەڵگەڕاوەكانی بەهــۆی ســواربوونی شەمەندەفەر و پاسەوە ، بەخێرایی ئەیگوشیت و ئەیخاتە گیرفانیەوە ، و لەوانەیە سەریشی بخاتە ناو كەشكۆلەكەیەوە تا پیداچونەوەیەكی وانەكانی پێشوو بكات ، یـان ملـی بەملاولایـدا بسورِێنیـت تـا نـوكتەیەك بچرپینیـت بەگـوێی هـاوریكەی تەنیشتی ( كە زۆرجار نابەجین ) كاتێكیش كە مامۆستا دیتە ژوورەوە بێدەنگی بـاڵ دەكیشـیت بە سـەر هـۆڵەكەدا ، وای لیـدیت گویـت لەدەنگـی گەدە بەتاڵەكـان دەبیـت كە فریـای نـانخواردنی بەیـانی نەكەوتـووە ، مامۆسـتا لە پێشـیان لەسـەر ( شـانۆ / منصـە ) كە دیـت و دەچیـت ، بە هەنگـاوە هێمـنە بێـدەنگەكان ، دەنگـی و جەسـتەیی و ئەنـدامەكانی جەسـتەیی و خانەكانیشـی بێـدەنگ و ئـارامە ، وەك ئەو ئــــارامی و بــــی گــــرفتیەی گەدەی لەپــــاش خــــواردنیكی چەوری بەلەزەت ، خوێنــدكارەكان چاوەكانیــان لیكــدەنین تــا هەســت بەو كەش و هەوایە بــكەن ، و ئەزانن كە ئەوە خەونیكی كۆنی سەردەمی منداڵیە ، لەو كـاتەی كە هەستیان بەو بریق و باقەی نیو چاوی دایكان و باوكانیان دەكرد كاتێک لە هەوادا نـاوی دكتـۆر دەنگی دەدایەوە و زەنگی لیدەدا .

ئەو لە كورسـیەكەی دواوە دانیشـتبوو ، چاوەكانیـانی نەدەبینــی ، بەڵكـو چـاوی لە پشتیان بوو ، و هەمووی بەرەو پێشـەوە چەمـاونەتەوە بەسـەر كەشكۆلی وانەكانـدا ، هەستیكی وای لادروست دەبیت كە ئەوانە بۆ هەتایی ئاوا چەماوەو چالاك دەبن ، پێـی سـەیرە كە دوای كۆتـایی وانە ئەیانبینیت ، ئەجولێن و بەخێرایـی هەڵدەستن و بەرە و دەرگاكە دەرِۆن ، پی لەپێی یەكتر دەنین ، و بە ئەنیشك و دەست پاڵ بەیەكترەوە دەنین ، و كاتێكیش كە ئانیشكی یەكێک بەر مەمكی خوێندكاریكی كچ دەكەویت ، خەندەیەكی كورتی شاراوە دەیگریت و بە دەنگێكی هێمنی نەبیستراو لەبەرخۆیەوە ئەڵیت : ئاە ! و پاشان جانتا هەڵئاوساوەكە بەكتێبەكان ئەنوسینیت بە سـنگیەوە . لەو سـاتەدا بەركەوتنــی ئەو مەمـكە تەر و پـاراو دەبیـت وەك تریـاك هەڵدەكشیت لە ئانشكەوە بۆ شـانەكان و لەویشـەوە بۆ گەردنـی . و ماسـولكەكان

دینەوە یەك و گەردنەکان توند دەبن ن تێڕوانینەکان توند دەبن ، و چاوەکان توند دەبن و وەك خاڵی ناوەندی گوریسیکی لیدیت کە لەهەردوو سەرەوە بەسترابیتەوە ، لەسەر روکاری دەرەوە ئارام بەڵام لە ناوەوە خانەکان لە هەژانیکی نەبینراودان ، جوڵەیەکی پتەوی شیتانە بەرهەڵستی توندی و ڕاکێشان دەکات ، و ماسولکەکانی چاوەکانیش دەچن بۆلای هەر جیگەیەك کە تەرِی گۆشتنی تیدا بیت ، و هیچ جیاوازییەك ناکات لە نیوان شانەکان و مەمکەکان و جانتا چەرمەکان ، و هەریەکێک لەوانە بێئەوەی هەست بکات بە ددانەکانی گاز لە جانتا چەرمەکەی سەر سنگی ئەگریت و پارچەیەکی لێدەکاتەوە و دەیسویتەوە ، و کاتێکیش کە هەست دەکات ئەوە پارچەیەك چەرمە لە دەمیدا شەرم لەخۆی دەکات و ، بە لەپی دەستەکانی کونەکانی سەر جانتاکە دەشاریتەوە ، لە شەمەندەفەرەکەشدا هەموو شتێک لە توانای خۆیدایە ، خۆی بە پەستینراوی ئەبینیتەوە ، بەبی ئەوەی دەستی لەو کارەدا هەبیت لەنیوان مەمکی ئافرەتیکدایە ، لە نیوەشەویشدا کتێبەکانی توێکاری دادەخات و دەنویت ، بەڵام جەستەی نایەویت بنویت لەبەرئەوەی تریاك لە جیگەیەکی دەستنیشانکراودا کۆبۆتەوە ، سەریکی تیژی وەك سەری دومەڵی هەیە ، و تەنها پەستانیکی دەستی ئەویت و ئەتەقیت .
ئەو بەتەواوی هەستی دەکرد کە ئەو خوێندکارانەی خۆشناویت ، ئەو پاڵەپەستۆیەیانی خۆش نەدەویست بەرە و دەرگاکە ، بە عەینەکە سپیە ئەستورەکانیان و چاوە توندەکانیان و ئەنیشك و پەنجە گرنجەکانیان ، و داگیرکردنی کورسیەکانی پێشەوە ، پشتە چەماوەکانیان ، و لە پشتەوە پشتەملەکانیان دەبینیت لە سەر و ئیخەی سەدریە سپیەکانەوە کە پێستیکی ئەسمەر دیارە .
پاشان شتیک ئەچرپینیت بەگوێی هاورِیکەی تەنیشتی ، و هاورِیکەشی پێکەنینێکی قوڵی شاراوە دەیگریت و پێی ئەڵیت : عاقل بە بهیە ، و بیریك لە دوارِۆژت بکەرەوە .
هەستیکی شاراوە ، بەڵام پتەو ، وایلێدەکات هەست بکات کە دوارِۆژی لەم وانە دورودرێژە بیتامانەدا نیە ، و نەك لە بەدەستهێنانی برِوانامەی پزیشکی ، و هەڵواسینی لافیتەی گەورە لە مەیدانی پزیشکان ( دکتۆرە بهیە شاهین ) و پاڵدانەوە لەناو ئوتومبیلدا . هەموو ئەمانە ، لای ئەو هەستیکی شاراوەن ، بی

واتـان ، وەك پەڕەیەكـی سـپی كە هـیچ نوسـینیكی لەسـەر نـیە ، وەك شـەوانی ڕەشی بی ئەستیرە ، وەك كەونی بەرین كە هەمووی یا سپیە یا ڕەش و جیاوازی نیە ، لەبەرئەوەی هەمووی یەك ڕەنگی هەیە .
ئەوكات گاڵتەجاڕی كەونی بۆ دەردەكەویت لە دەوروبەری و گاڵتەجاڕی ژیان ، و گاڵتەجاڕی ئەو مامۆستایەی جگەرەكەی ناوە بەلایەكی لیویەوە ، گاڵتەجاڕی ئەو پشتە چەماوانە بەرەو پێشەوە و ئەو پشتەملە ئەسمەرانە .
كەشكۆل و كتێبەكانی دەخاتە جانتاكەیەوە و بە جوڵەیەكی خێرا جەستەی لە كورسیەكە دەكاتەوە ، و بەجوڵەیەك بۆ دواوە لەدەرگای پشتەوەی هۆڵەكە دەچیتە دەرەوە ، و لەماوەی كەمتر لە چركەیەكدا بەتەنها هەر خۆی دەبیت لە گۆڕەپانی بەرینی كۆلیجدا .
لەگەڵ هەنگاونانی لەخۆی دەپرسیت كە ئەو چی دەویت لە ژیاندا ، و وەڵامی ئەم پرسیارە بە هەڵواسراوی لە هەوادا دەهیڵیتەوە ، و هەوا وەڵامەكە لەپێش چاویدا وەك میلی كاتژمیر دەهینیت و دەبات ، و بە بنە پێی بە توندی لە زەوی دەدات و پاشان هەست دەكات كە ئەو شتێكی دیاریكراوی دەویت لە ژیاندا ، شتێك كە بتوانریت بە تەنها خاڵیك دەستنیشان بكریت ، بتوانیت بە نوكی پەڕیك لەسەر رووی لاپەڕەیەكی سپی بیكیشیت ، و بتوانیت بە سەری پەنجە دەستكاری بكات و دەستی لیبدات ، بە هەمان ئەو متمانەیەی كە دەست لە جەستەی خۆی دەدات لەژیر جلوبەرگەكانی و ئەتوانیت سنوری جەستەی دیاری بكات ، و جیای بكاتەوە ، لە جەستەكانی تر ، و لە زەوی جیا بكاتەوە بە جوڵەیەكی قاچی .
لەسەر جیگاكەی لە ژوورە بچكۆلانەكەیدا ، لە سەقفەكە ورد دەبیتەوە ، خۆی دەبینیت دانیشتووە لەسەر كورسیە سورە بچوكەكەی ، و لەبەردەمیدا میزە سورە بچوكەكە هەیە ، و كتێبەكان و كتێبی خوێندنەوەی لەسەرە ، بەرگەكەی شینە ، و ناوەڕاستی پانتاییەكی سپیە ، ناو : بهیە شاهین ، پۆل : یەكەمی سەرەتایی ، و كاغەزە سپیەكە لە دەفتەرەكە دەكاتەوە ، و بە جوڵەیەكی هیواشی دەستە بچكۆلانەكانی و بە فڵچەكە هیڵیكی درێژ دەكیشیت ، و لە شیوەكەیەوە ئەزانیت كە ئەوە دەست و خەتی خۆیەتی ، و ئەو دەستەش دەستی خۆیەتی ، و پەنجەكانی دەوروبەری فڵچەكە پەنجەی خۆین ، و بەویستی خۆی دەیجوڵێنیت لەسەر رووی

پەرِه سپیەکە و چەند هێڵێك دەكێشێت ، بازنەیەكی گەورە دروست دەكات و لە ناویدا دوو بازنەی بچوك و لەبەردەمیدا دەموچاوێك دەردەكەوێت كە بە دوو چاوی ڕەشەوە لەسەر رووی پەرِه سپیەكەوە لێی ئەرِوانێت ، وەك دوو چاوی گەشی ڕەش لە ئاوێنەوە سەیر بكات ، سەرنجی هێڵەكان و شێوازی دەموچاوەكە دەدات ، و دەیناسێت وەك چۆن دەموچاوی خۆی و لێی تێك ناچێت ، و ئەتوانێت لە ناو دەموچاوەكانی تردا جیای بكاتەوە ، و ئەتوانێت بە پەنجە هەست بە رووەكەی بكات ، و بەو متمانەیەی كە هەست بە جەستەی دەكات ، و هەست بە سنوری دەرەكی دەكات لەژێر جلوبەرگەكەیەوە .

باوكی دەرگاكەی كردەوە ، و كاغەزەكەی لەژێر كتێبی خوێندنەوەكەدا شاردەوە ، بەڵام پەنجە گەورەكانی كتێبەكەی بەرزكردەوە و كاغەزەكەی راكیشا بە هێڵەكانەوە و بە دەستە گەورەكانی دەكێشێت بەدەستیداو دەڵێت : كاتی سەعیت بەم شتە پرِوپوچانەوە دەكوژێت ! و بە دەستە گەورەكانی كاغەزەكە چرچ و لول دەكات و ئەیهاوێژێتە سەبەتەی خۆڵەكەوە .

كاتێك دەچێتە دەرەوە ، هێڵەكانی لیوە دیار دەبێت بە نوشتاوەیی لە نزیك خۆڵ و پیسی ماڵەكەوە ، و هەر لە وردبوونەوەدا دەبێت لێی و لە هەمان كاتدا لە روخساری خۆی ورد دەبێتەوە لە ئاوێنەكەدا . و كاغەزێكی نوی لێدەكاتەوە ، و بەجوڵەیەكی نەویستراو هەمان هێڵەكان ئەكێشێتەوە ، لەگەڵ ئەوەی كە منداڵە هەست دەكات كە شتێك ئەیبەستێتەوە بەو هێڵانەوە ، وەك وایەرە نەبینراوەكانی كارەبا ، یان هێڵە حەریریەكان كە لە هەوادا ونن ، درێژ دەبێتەوە لە نیوان ئەو و هێڵەكانی سەر لاپەڕەكە ، و متمانەی ئەداتی سەبارەت بە جوڵەی دەست و مەچەكی ، و شێوازی پەنجەكانی ، وبەرزیەكانی ، و ڕەشایی چاوەكانی .

و گوێبیستی دەنگی باوكی دەبێت كاتێك دانیشتووە لە هۆڵەكە لەسەر كورسیەكی تەختە ، و كاغەزەكە ئەشاریتەوە لەژێر كتێبی خوێندنەوەكەدا ، و چەند دیرِیك لە كتێبەكە ئەخوێنێتەوە بەدەنگی بەرز ، لەگوێیدا دەنگ دەداتەوە وەك دەنگی كەسێكی تر ، ناوەكەشی بە بەرگی دەرەوەی كتێبەكەی پی سەیرە ، وەك ئەوەی ناوی خوێندكاریكی تربیت ، عاقڵ و گویرِایەڵ ، گویرِایەڵە و ئەركەكانی

خوێندنی جیبەجێ دەکات ، و ڕاستی خودی خۆی لەنیوان لاپەڕە نوشتاوە شاراوەکەدا هەڵدەگریت .
لەو ساتەوەی هەستی بە ژیان کردووە ئەو پرسیارە لەخۆی دەکات : بۆچی هەموو ئەو شتانەی حەزت لێیە قەدەغەیە و حەرامە ؟ ، تەنانەت خواردنیش چەند جۆریکی دەسەپینن بەسەرتدا کە تۆ حەزی لی ناکەیت ، دایکی بەزۆر دەیخاتە دەمیەوە ، کاتێکیش لا دەکاتەوە تفی دەکاتەوە ناو قاپەکە ، باوکیشی دوژمنایەتی هەیە لەگەڵ هیلەکانیدا ، هەر کە لەسەر کاغەزەکە بەدی بکات ئەیچرچینیت و فرِیی دەداتە ناوخۆڵی ماڵەکەوە .
وەك بەربەستیکی درێژی پتەو ، باوکی دەوەستا لەنیوان ئەو و خودی ڕاستەقینەی ، بە پتەوی و گەورەیی جەستەی لیکی جیا دەکردنەوە ، ودەنگە زبرە بەهیزەکەی ، دەستە گەورەکانی و چاوە گەورە و فراوانەکانی لە ریرِەوی ماڵەکەدا . کاتێک دەنگی زەنگی دەدایەوە : بهیە ! هەستی دەکرد کە ئەو کەسێکی تر بانگ دەکات ، بەڵام وەڵام دەداتەوە و دەڵێت : بەڵی ، و لێی دەپرسیت ئەرکەکانی خوێندنت تەواو کردووە ؟ و ئەویش بە دەنگێکی ئەدەبیانەی گویرِایەڵ دەڵێت : بەڵی . و دەنگی دەگات بە گوێی و هەست دەکات کە ئەوە دەنگی ئەو نیە .
کاتێکیش باوکی لەهۆڵەکەی ماڵەوە دوردەکەوێتەوە ، و دەچیتە ژوورەکەی خۆی ئەوکات گوێبیستی دەنگی ڕاستەقینەی خۆی دەبیت ، و دەتوانیت شێواز و دەنگی تایبەتی خۆی جیابکاتەوە ، وەك چۆن شێوازی دەموچاوی جیادەکاتەوە ، و بە پەنجە باریك و وردەکانی ئەو پارچە کاغەزە سپیە لێدەکاتەوە کە تایبەتە بە نوسینی ناو و ناوەرۆك لەسەر بەرگی کتێبەکە ، بەنوکی فڵچەکە هەرچی بویت لەسەر رووی لاپەڕە سپیەکە دیاری دەکات ، کاتێکیش وینە دەکات دوو چاوی گەورەی سورهەڵگەڕاو و سمیڵیکی ڕەشی درێژ و دوو لەپی گەورە وچەند پەنجەیەك ئاڵاون لە گۆچانیکی درێژەوە .
باوکی سمیڵیکی ڕەشی درێژی نەبوو ، بەڵام هەموو ڕۆژێک لەکاتی هاتن و چونی بۆ خوێندنگە ئەو پۆلیسەی ئەبینی لە شوینەکەی خۆی لەسەر سوچی کۆلانەکە وەستاوە . لە دەموچاویدا تەنها سمیڵیکی درێژی ڕەشی ئەبینی ، کاتێکیش لێی نزیك دەبوەوە هەنگاوەکانی خێراتر دەکرد یان رایدەکرد تا ماڵەوە .

بەڵام گۆچانە درێژەكە ئەوا هەموو بەیانیەك كاتێك لە پشتەوە دادەنیشت لە خوێندنگە لەپێش چاوی دەهاتوو دەچوو ، دەنگی مامۆستا كچەكەش تیژ و گەورە وەك دەنگی باوكی : بهیە شاهین . خێرا ئەدەبیانە و گوێرِایەڵانە هەڵدەستاو وەڵامی دەدایەوە : بەڵی .

تەنها ڕۆژێك كە حەزی پێی دەكرد و خۆشی دەویست ڕۆژی هەینی بوو . لەبەرئەوەی ناچیت بۆ خوێندنگە ، و لەسەر جیگەكەیەوە ئەكشیتە سەر كورسیە سورەكەی ، و لەناوەڕاستی كتێبەكەیەوە لاپەرە سپیەكە دەردەهینیت ، و پەنجە بچكۆلانەكانی لە فلْچەكەوە ئەئاڵینیت ، و دەست دەكات بە كیشانی هیلەكان ، جارجار لە جانتاكەی قەڵەمیكی سوریشی دەردەهێنا ، یان شین ، یا سەوز ، كە لەپاشەكەوتی خۆی كرِیبوونی لە دوكانەكەی نزیك خوێندنگە ، یان لە هاورِییەكی وەرگرتبوو ، و هیڵەكانی ڕەنگ دەكرد ، و بۆ درەخت گەڵای سەوزی دروست دەكرد ، و بۆ دەریا ئاوی شین ، و بۆ خوێن ڕەنگی سور . ئەو چۆن زانی كە ڕەنگی خوێن سورە ؟.

یەكەمین دڵۆپە خوێن كە بینی ئەو دڵۆپە بوو كەلەسەر بیجامە سپیەكەی بینی . وەك بازنەیەك وینەی دەكیشا لە ناوەڕاستی لاپەڕەكەدا ، چاوەكانی منداڵە بچكۆلانە ترساوەكەش دوو بازنەی فراوان بوون ، جەستەشی جەستەیەكی بچكۆلانەی باریك وەك جەستەی پاسارییەكی ترساوی پەنا دیوار ، و چاوانیكی زۆر وەك بازنە سەرنج دەدەن و بە دەستە بچكۆلانەكانی بیجامەكەی لە چاڵیكدا لە پشت دیوارەكەوە ئەشاریتەوە ، و بەبی بیجامەی ژیرەوە بەشەقامەكەدا دەڕوات ، هەوایەكی بەهیز لە نیوان قاچەكانیەوە دەرِوات و دەیەویت كراسەكەی هەڵداتەوە و رانەكانی دەرخات ، و ئەویش بەهەردوو دەستی بەرهەڵستی باكە دەكات و كراسەكەی ڕادەكێشێت بۆ خوارەوە ، و بەسەر شەقامە چیمەنتۆكەدا درِوات و جانتا چەرمە پرِ لە كتێبی بیركاری و خوێندنەوەی بەدەستەوەیە .

كاتێكیش لە كۆشكە تەختەكەی سەر سوچی كۆڵانەكەیان نزیك دەبیتەوە لەنیوان قاچەكانی دڵۆپیك خوێنی گەش دەكەوێتە سەر چیمەنتۆكە ، و شیوەی بازنەیەكی سور وەردەگریت لەسەر زەویەكە ، گەشە دەكات و فراوان دەبیت تا ئەبیتە

قەبارەی ئەستێرەی خۆر ، پۆلیسەکە بە سمێڵە ڕەشە درێژەکەیەوە لێی ورد دەبێتەوە ، و لەپشتەوەی کۆشکەکە لوتی دەردەکات و بۆنی خوێنەکە دەکات ، و جانتاکەی دەخاتە سەر زەوی و بە پرتاو رادەکات بۆ ماڵەوە .
بە قورسیەك سەری دەجوڵێنیت لەسەر سەرینەکە و جانتا چەرمە هەڵئاوساوەکەی بە کتێبەکانی توێکاری ئەبینیت لەسەر کتێبخانە بچکۆلانەکەی ، و لەسەر میزەکەشی کەڵەسەریکی لێیە ، و کەشکۆلەکان ، و کوپێک ئاو گوڵێکی سوری تێدایە .
هەستاو لوتی نزیك کردەوە لە گوڵەکە ، و بەتیلەی چاو ڕۆژژمیرەکەی بینی بە دیوارەکەوە و زانی ڕۆژی تاقیکردنەوەکان نزیك بۆتەوە . کەشکۆل و کتێبەکانی کۆکردەوە و خستنیە سەریەك لەلایەکەوە و دانیشت سەرنجی کەڵە سەرەکەی دەدا ، کەڵە سەری مرۆڤێك چەندین ساڵە مردووە ، لە کارگوزاری بەشی توێکاری کۆلیجی کڕیبوو بە 3 جونەیە . ساڵی پێشوو بە یەك جونەیە بوو ، بەڵام ئێستا نرخەکان بەرز بونەتەوە و لاشە دەست ناکەویت و چۆتە بازاڕی ڕەشەوە ، کابرای حانوت لەگەڵ کارگوزارەکەدا شەریکە ، لەگەڵ پاسەوانی قەبرستان ، کاتێک کە شەمەندەفەر لە کەسێک دەدات و دەیکوژیت و بیخاوەن دەردەچیت کابرای حانوت کەسێکی بۆ پەیدا دەکات کە بڵێ من باوکی ئەو مردوەم و چەندین فرمێسکی ڕاستەقینەی وەك باوکی ئەو مردوە بە درۆوە هەڵدەڕژیت و پێی ئیمزا دەکات و لاشەکەی تەسلیم دەکات و ئەبیت بە موڵکی حانوت و هەرچی بویت لێی دەکات ، وەك چۆن باوك کە کچی ببیت چی بویت و چۆنی بویت وایلێدەکات .
باوك کچەکەی خۆی دەفرۆشیت بە پاسەوانی قەبرستان ، و ئەویش دەیفرۆشیت بە کابرای حانوت ، و ئەویش دەیفرۆشیت بە کارگوزاری بەشی توێکاری کۆلیج ، لەویشەوە بۆ راگری کۆلیجی پزیشکی ، یان دەفرۆشریت بە خوێندکارە دەوڵەمەندەکان ، ئەوانەی کە لەماڵەوە دەخوێنن و بە تەنازولی دەزانن بین بۆ هۆڵی توێکاری بۆ خوێندن .
بهیە لە کەڵە سەرەکە ورد بوەوە ، چەند قڵیشیکی بە کەڵە سەرەکەوە بینی وەك برین و ئێسکی رومەتەکان بەرزبوون و چاڵی چاوەکان لە قوڵیدابوون لەسەر

نیوچاوان ، و شەویلگەكان زبر و لەسەر و خوارەوە شوینەواری ددانەكانی پیوە دیاربوو .
وەك دەموچاوی ئەو مندالەی بە كراسیكی شرِۆڵەوە سواری شەمەندەفەرەكە دەبیت ، و بە دەستیەوە چەند پاكەتیك لە دەرزی و شقارتە و شانەی پێیە ، و بەدەنگێكی كپی بی هیواوە هاوار دەكات ، و لەم شەمەندەفەر بۆ ئەو شەمەندەفەر باز دەدات ، بە قاچێكەوە ، و بە دووچاوی گیژەوە لە خەڵكی دەرِوانیت ، لەنیو دەموچاوەكاندا بەشوین دەموچاویكدا دەگەرِیت لە دەموچاوی دایك و باوك بكات ، دەست بكات بە گیرفانیدا و چەند قرشیك دەربكات و چەند دەرزیيەك یان شانەیەكی لی بكرِیت .
بەڵام دەموچاوەكانی دانیشتووی ناو شەمەندەفەرەكە دەموچاوی دایكی و باوكی تیدا نەبوو ، بەڵكو بە قودرەتی قادر ئەو دەموچاوانە بوون كە هەموو وەك یەك وان ، وەك دیوی پارەكانی حكومەت هەمووی لیكچوو ، بێدەنگ هەموو دانیشتوون و بەیەكەوە نوساون و بەشی خوارەوەی جەستەیان نوساوە بە كورسیەكانەوە و بەشی سەرەوەشیان جوڵەی لەگەڵ جوڵەی شەمەندەفەرەكەدایە ، كەللەسەرەكانیان وەك میلی كاتژمیر دیت و دەچیت ، و قاتە هەڵئاوساوەكانیان وایكردووە هەموو شانیان لەیەكتر گیرببیت و بۆینباغەكانیشیان لە ملیاندا وەك پەتی سیدارە وایە ، كاتێكیش لەپرِ شەمەندەفەرەكە دەوەستیت هەموو سەریان دەچیت بۆ دواوە و لەسەر كورسیەكانیان رادەپەرِن و دەست دەگرن بە سەر و كەللەیانەوە و بەملاولای خۆیاندا ئاورِ دەدەنەوە . و لە هێمنیەكدا هاواری مندالەكە دیت .
چاوەكان وەك بازنەی زەرد لە ژیر تایە و سكەی شەمەندەفەرەكە و ئەو جەستە شیلراوە دەرِوانیت ، و لەنزیك لاشەكە دەرزییەكان و شانە و پاكەتە شقارتەكان بڵاوبوونەتەوە ، و لەسەر چیمەنتۆكەش دڵۆپە خوێنی سور پرشنگ دەداتەوە ، زەوی داپۆشیوە و بازنەكانی فراوانتر دەبن دڵۆپە خوێنەكان هیندەی قەبارەی ئەستیرەی خۆر فراوان دەبن ، هەردوو چاوە گیژەكەش لەژیر تایە ئاسنینەكەی شەمەندەفەرەكەوە وەك دوو چاڵی قوڵن لە ناو سكی زەویدا .

هەریەکێکیان بە دەست لیدانی سەر و قۆڵ و جەستەی خۆی دڵنیا دەکاتەوە کاتێک دەزانیت سەری لەجیگەی خۆیەتی و جەستەی لەسەر کورسیەکە ماوە و هیشتا خوێن لە دەمارەکانیدایە خەندەیەك لیوی دەگریت ، و بریقەیەك لە چاوەکانیان دروست دەبیت ، و لەوانەشە تەوقە لەگەڵ یەکتری بکەن و شادی و شوکرانەی خوداوەند بکەن کە بیزیانن و شەمەندەفەرەکە جەستەیەکی جگە لە جەستەی ئەوانی شیلاوە ، دەستەکانیان بەرز دەکەنەوە بۆ ئاسمان و چەندین ئایاتی شوکر ئامێز و سوپاسگوزاری دەخوێنن ، بەبۆچونی خۆیان خوداوەند بەرتیل دەدەن و بەم چەند وشەیە وایلی دەکەن بیری بچنەوە و بۆ هەتایی سەریان بیزیان لەسەر جەستەیان بیت .

بهیە بە دەستی کەڵەسەرەکە دەجوڵێنیت و رووی چاوەکان دەکاتە دیوارەکە ، کتێبی توێکاری دادەخات و دەستی درێژ دەکات بۆ پشتی سیسەمەکەی و لاپەڕە سپیەکە ڕادەکێشێت ن پاڵی دەدات بە دیوارەکەوە و لەبەرامبەری دادەنیشیت لەسەر زەویەکە و لە نزیکی فڵچە و ڕەنگەکان .

ژوورەکەی تەواو تاریکە تەنها گڵۆپیك نەبیت کە تیشکەکەی ئاڕاستەی ئەو تابلۆیەی بەردەمی کردووە ، و ئاسمانیش لە پەنجەرەکەوە دیارە تاریك و ڕەشە ، شەو بێدەنگە و باوکی نوستووە ، هیچ دەنگ و جوڵەیەك نیە ، تەنها خشەی فڵچەکان نەبیت دین و دەچن بەسەر رووی تەختی تابلۆکە ، بە جوڵەی دەست و پەنجە بچوکەکانی ئاڕاستەی فڵچەکەی بۆ کوی بویت وا دەیبات ، بە زەحمەتیکی زۆر پیڵوەکانی لەسەر چاوی بەرز دەکاتەوە تا بەرهەڵستی خەو بکات ، و بەردەوام بیری لای هیڵەکان ، و پەڵە ڕەنگەکانە ، و ورد دەبیتەوە و جارجار بی ئەوەی هەست بکات بە دەمی فڵچەکە دەکیشیت بە دەموچاوەکاندا ، و بە پەنجەکانی ماسکی دەموچاوی ژیر تایەی شەمەندەفەرەکە ڕادەکێشێت ، و جەستە شیلراوەکە لە ژیر تایەکان دەردەکات ، و کەڵەسەرە بچکۆلانەکە بە گۆشت دادەپۆشیت و چاڵی چاوەکان دەکات بە دوو چاوی ڕەش وەك چاوەکانی خۆی بەیانی لە دەنگی بەرز و تیژی باوکی خەبەری دەبیتەوە وەك زەنگی کاتژمیر ، و پانتۆڵە ڕەشەکە و بلوسە سپیەکە لەبەردەکات ، و جانتا چەرمە هەڵئاوساوەکەی بە کتێب هەڵدەگریت و بەرە و ویستگەی شەمەندەفەرکە بەریدەکەویت . بەپێی لە زەوی دەدات و قاچەکانی جیادەکاتەوە لە هەنگاوەکانیدا ، کاتێکیش دەم وچاوە

لیكچوەكان دەبینیت لە شەمەندەفەرەكەدا لیوی دەگەزیت لە تورەییدا ، و كاتێكیش هاورِێكانی دەبینیت بە قاچە جوتەكانیانەوە بە جوڵەیەكی بازنەیی سەیر ئەرِۆن هەست دەكات كە ئەوان لە جۆریكی تری مرۆڤن و ئەم لە جۆریكی ترە . و لە هۆڵی توێكاری دەوەستیت و قاچێكی دەخاتە سەر میزەكە و قاچەكەی تری بەدرێژی دەچەقیتە زەوی ، ئێسكەكانی ریك و یەكسان و ماسولكەكانی پتەو ، و بەتیلەی چاوی لە خوێندكارەكان ورد دەبیتەوە كە بە عەینەكە ئەستورە سپیەكانیانەوە چونەتە ناو كتێبەكانی توێكاری ، و لوتە سور هەڵگەراوەكانیان ، و پشتە چەماوەكانیان بەسەر لاشە مردووەكاندا دەسورِێتەوە وەك كەسێک كە رِێگای هەڵە كردبیت . بەڵام نەشتەرەكە لەنیوان پەنجەكانیتی و كتێبی توێكاریە بەرگ شینەكەی و لە سەر بەرگەكەی لە پانتاییەكی سپیدا ، ناو : بهیە شاهین ، پۆل : یەكەمی توێكاری ، لای جیگەی سەرسورِمانە ، و نەشتەرەكە دەهینیت بە گۆشتی لاشە نوقم بوی فۆرمالینەكە لە سەرەوە بۆ خوارەوە ، و نەشتەرەكە بەر شتێكی رەق دەكەویت ، بە سەرەكەی تری نەشتەرەكە دەردەهینیت ، و دەكەوێتە خوارەوە بۆ سەر میزەكە و دەنگێكی سەیر دەردەكات ، بە نەشتەرەكە دەیكات بە دوو بەشەوە دەبینیت تۆپەڵیك خوێنی مەیوی تێدایە ، بەستویەتی ، و رەش بووە .. یەكێک لە هاورِێكانی پێكەنینێكی مێینەیی شاراوە دەیگریت و دەڵێت : وامزانی فیشەكە ! هاورِییەكی تری سەر دینیتە پێشەوە و لە دڵە دوو بەشەكە دەرِوانیت و بە سەرسورِمانەوە دەپرسیت : فیشەك لە دڵدا ؟ یەكێكی تریان بە لەپی دەستی دەمی دەشاریتەوە و هەناسەیەكی قوڵ وەردەگریت و دەڵێت : ئەی گیان ! یەكێكی تر هەناسەیەك هەڵدەمژیت و بەدەنگێكی بیستراو دەڵێت : بریا من بومایە .

پێویست نیە شێوازی ئەم قسانە لە هۆڵی توێكاریدا بوتریت لەبارەی مردنەوە . لەبەرئەوەی مردن لیرەدا مردن نیە ، و لاشەكەش كەسێكی مردوو نیە ، و تۆپەڵیك خوێنی بەستووی لەشیوەی فیشەك لەدڵدا لەوانەیە حەزیكی شاراوەی زیندە بەچاڵ بیت لە ناخی نەفسدا ، وەك ئەوەی دڵ ببیت بە دوو بەشەوە و خوێن بی هۆكاریك لە سورِانی خۆی بكەویت و لە دەمارەكاندا بیبەستیت . ئەوە مردنە كە مرۆڤ ئاواتی پی دەخوازیت و لیشی دەترسیت ، بەدوایدا دەگەرِیت

و لیشـــی هەڵـــدیت ، و هەســـت دەكـــات لە هەمـــوو جـــیگەیەك هەیە و لە هـــیچ شوینیكیش دیار نیە تەنانەت لە هۆڵی توێكاریش .
بهیە ئـاوڕی دایەوە بۆ ئەو هـاورِییەی وتـی ( بریـا من بومـایە ) و لێی پرسـی : حەز دەكەیـت بمریـت ؟ هـاورِیكەشـی هەناسـەیەكی نكـوڵی هەڵمـژی : مـردن ؟ خوانەكا خوشكم .
ئەوكـــات بهـــیە هەســـتی بەو نەهـــامەتیە كـــردو زانـــی بـــۆچی مـــرۆڤ حەزە ڕاستەقینەكانیان دەشـارنەوە ، لەبەرئەوەی ئەوانە حەزیكـن تونـد و كوشـندەن ، و لەبەرئەوەی مرۆڤ نایەویت لەناوبچیت و بپلیشیتەوە بۆیە ژیـانیكی بێدەنگی بـی حەزی ڕاستەقینەی پی باشترە .
بهیە سەری ئەم داوەی گرت ، و دەستی كرد بە ڕۆیشتن بەرەو سەرەكەی تـری ، و ئەشـزانیت كە سـەری تـری نـیە ، و بەڵكـو گیـژاوی لەنـاوچوونە . سـەرجەم نەشـتەر و كەلـوپەلی توێكـاری كۆكردەوە و خستنیە جانتـا چەرمەكەیەوە و هـاتە دەرەوە لە هـۆڵی توێكـاری ، لە نزیـك كـۆلیجەوە بە هەنگـاوی فراوانـــی خێـرا دەرۆیشـــت و هەســـتی دەكـــرد لە مەترســـی نزیـــك دەبیـــتەوە ، خوازیـــاربوو بـگەرِیتەوە بۆ هۆڵی توێكاری بەڵام نەیدەتوانی ، بەهەستیكی شاراوە هەستی دەكرد ڕاپێچی ئەم مەترسیە كراوە ، بۆ لیوی گیژاوەكە .
بهیە ! ناوەكەی وەك زەنگیك ڕایچڵەكاند ، و لەشۆرِشیكدا زانی كە جەستەیەكی تایبەت بەخۆیی هەیە توانـای جوڵانـدنی هەیە بێئەوەی كەون لەگەڵی بجوڵیت ، و ناویكی تایبەتیشـی هەیە ، كاتێـك لەهەوادا دەنـگ دەداتەوە شۆرشیك بەرپا دەبیت . لەهەر جارێكـدا گوییبسـتی نـاوەكەی دەبیـت سەرسـورِمـان دەیگریـت . چ هیزیكی ئاڕاستە كراوە توانای دەستنیشانكردنی نـاوەكەیی هەیە لە نیوان ناوەكـانی تـردا ، و چ مـوعجزەیەكە تـوانی جەسـتەی لەنیو ملیۆنـان جەسـتەدا كە لە كەونـدا مەلە دەكەن دەربكات .
كاتێـــك ڕاوەســـتا بـــۆی دەركەوت كە هیشـــتا لە نزیكـــی كـــۆلیجە ، و لەبەردەم لافیتەیەكـی گەورەدایە هەڵواسراوە بەسـەر دەرگـایەكی ڕەنـگ سـەوزیكی تـاریكی بچـوك . ئەم وەسـتانە تەنهـا نیـو خـولەكی خایانـد ، خەریـك بـوو لابكـاتەوە و بگەرِیتەوە بۆ دەرگـای توێكاری و بچیتە ژوورەوە بۆ هەتـایی نەیەتەوە دەرەوە

. بەڵام نیو خولەك بۆی هەیە ئاڕاستەی ژیانی مرۆڤ بگۆرِیت . لەوانەیە بۆمبیك لە نیو خولەکدا بتەقیتەوە ، و شێوازی شارەکە و زەوی بگۆرِدریت . رووداوە مەترسیدارەکان لە ژیاندا بەخێراییەکی زۆر لە چرکەکاندا روودەدات ، و هەندێک جاریش لەچاو تروکانیکدا ، بەڵام رووداوە بی بەهاو هیچەکان بە هێمنی روودەدەن ، و لەکاتە درێژەکاندا کە لەوانەیە تا کۆتایی تەمەن بخایەنیت .

کاتێک چاوەکانی لەسەر لافیتەکە هەڵگرت هەستیکرد کەسێک لەبەردەمیدا وەستاوە ، کەسێکی ئاسایی نیە ، و بەڵکو لەوجۆرەی مرۆڤە ، کە نابیت و ناشیت چاومانی بخەینە سەر و چەند چرکەیەك راینەگرین ، بەهۆی کەمی کات و شەرم کردن لە وردبوونەوە لێی ، گەرچی ئەو چرکەیە لە سەرنجدان بەسە بۆ چاوەکانمان بۆ هەتایی . لە دوای تیپەرِبوونی خولەکی یەکەم توانی سەرکەویت بەسەر ئەو خورپەیەدا و بە ویستی خۆی ورد ببیتەوە . و بە سەرنجدانیکی غەریزی بە وردی گەرِا بەدوای ئەو شتەی کە نا ئاساییە و ئەویشی ئاوا نائاسایی کرد لەپرِ . بینی نیوچاوانیکی ئاساییە و دوو چاوی ئاسایی و ، دەم و لوت ئاساییین . پێی سەیر بوو چۆن لەم هەموو شتە ئاساییانە ئەو دەموچاو و روخسارە نائاساییە دروست دەبیت .

لەو ساتەدا بەتەواوی لەبەردەمیدا بوو ، قاچی راستی خستبووە ناو دەرگاکەوە و خەریك بوو خۆی پیدا بکیشیت گەر سەری هەڵنەبرِیایە و نەیبینیایە ، کاتێکیش چاوی بە چاوی کەوت هەستیکرد کە سەرسورِمانی روخسار و دەموچاوەکە لە جوڵەی چاوەکاندایە ، کە جوڵەیەکی سەیرە ، جیاوازە لەگەڵ جوڵەی سەیرکردنی خوێندکارانی تر ، چاوەکانی ئەوان وەك ئەوە وایە نەبینیت ، و لەوانەیە هیچیان پینەکریت ، بەڵکو تەنها کراوەن و هیچی تر ، وەك ئاوینەیەك شتەکانی تیادا دووبارە دەبیتەوە . بە واتایەکی تر چاوانی خوێندکارەکانە ، پیادەی کردەی بینینی راستەقینە ناکەن ، لەو روانگەیەوە ئەوا شتەکان نابینن یان راستیەکانیان نابینن .

کاتێک چاوەکانی لە ئاست چاوەکانیدا جوڵاو سورِا هەستی کرد دەیبینیت . و هەستیکرد کە بۆیەکەمینجارە لە چاوانیکی جگە لە چاوەکانی خۆیەوە و لەلایەن کەسێکی ترەوە دەبینریت . تەنها لەبەردەم ئاوینەکەدا دەبینرا بە دوو چاوی رەشەوە کە چاوەکانی خۆی بوون . و لە شەقام و ناو پاس و شەمەندەفەر و

کۆلیج هەستی دەکرد چاوەکان نایبینن ، بیدەسەڵاتن لە جیاکردنەوەی لە نیوان هەزاراندا ، و ئەو ون دەبیت لەنیو چەندین لە جەستە لیکچوەکان ، و هیچ شتێک نیە هەڵیگریتەوە و لە ون بوون بیپاریزیت ، تەنها دەستەکانی نەبیت کاتێک بەر جەستەی دەکەوتن ، و بەڕاستی دەیزانی کە خاوەنی جەستەیەکی تایبەتە بەخۆی ، و چاوەکانی کاتێک بە ئاڕاستەی هیڵەکان لەسەر تابلۆ سپییەکە دەکیشران ، و جوڵەی دەستی دەبینرا و هەستی پیدەکرا ، و هیڵەکانی ئاسایی و لەبەرچاو بوون ، و جیاواز بوو لە کەون بە سنورە دەرەکیەکەی ، و سوورِان و ئاوڕدانەوە تایبەتەکەی بە جوڵەیەکی خێرای خۆ ویستانەی پتەو ، و سەرجەم ویستەکانی تری پی لەناو دەبرد ، و سەرقاپەکەی لەسەر جەستە لادەداو ماسکەکەشی لە روخسار دەکردەوە ، و ئەو پانتاییە سپییەی لیدەکردەوە لە سەر بەرگە شینەکە بەناوە خوازراوەکەیەوە .
بینی چاوە سەیرەکانی دەبیپشکنن وەك چۆن ئەو خۆی دەپشکنی لە ئاوینەکەدا ، و هەر لە چاوەکانیەوە دەچووە ناخی دورودرێژی ، و ساتەوەختیکی تری لەوجۆرە بەسە تا بگاتە کۆتایی . بەڵام ئەو سەری جوڵاند بەلایەکی تردا . دەترسا لە گەیشتن بە کۆتاییەکان . هەست بە مەترسی گەیشتن دەکات و دەزانیت گەڕانەوە چەند مەحاڵە ، و ئەو بە ڕێگەیەکی سحراوی دەبیتە مرۆڤیکی جگە لە بهیە شاهین ، واتە دەبیتە خودی خۆی .
ئەو بە وردی نەیدەزانی خودی خۆی چیە ، بەڵام بە متمانەوە دەیزانی کە بهیە شاهین نیە ، خوێندکاری پزیشکی زیرەکی بە رەوشت ، ئەم کچە ئەسمەرە ڕەنگ پەشۆکاوە دوودڵەی لەبەردەم دەرگاکەدا وەستاوە .
وشەی دوودڵ لیرەدا زۆر شیاو نیە ، و ڕاستیش نیە . ڕاستیەکە ئەوەیە کە ئەو هەرگیز دوودڵ نەبووە . ئەو توند بوو لە ڕۆیشتن بۆ پێشەوە بەبی وەستان ، و گەیشتن بە کۆتایی مەترسیدار . دەیزانی کە مەحاڵە هەر دەبیت بۆی بچیت ، لەبەرئەوەی چارەنوسیتی . چوونیشی چونیکی ئاسایی نیە ، بەڵکو بە هیزو توانایەکی زۆر تەیارکراوە لەلایەن حەزەکانیەوە بۆ زانینی چارەنوسی ، و بە ترسیکی زۆرەوە بۆ ئەم زانینە بەرەو ئاڕاستەی پیچەوانە دەرۆیشت .
گەر بهیە شاهین ڕاستی بوایە ئەوا لایدەکردەوە و هەنگاوێک دەچووە دواوە و دەچووەوە هۆڵی توێکاری و ئەمرِۆش وەك دوێنێ وادەبوو ، وەك بەیانی ، و

دەکەوتە گیژاوی ڕۆژانــی ئاسایی ، و ژیـانـی ئاسـایی ، و دەم وچـاو و روخســارە ئاساییەکان . بەڵام ئەو بهیە شـاهین نەبـوو . مرۆڤیکـی تـری شـەیتانی بـوو دایك و بـاوکـی نەیانخستبوەوە . روخسـاری لەو روخسـارە دەکـات کە لە ئـاوینەکەدا بەدی دەکرد ، بەڵام توند ترە ، ، چاوەکـانیش ڕەشیەکانیان تۆخ تـرن ، ، لـوت بەرزتـرە ، و پێستی ئەسمەرە بەڵام نەپەشۆکاوە ، بەڵکو سورە لەڕەنگی خوێن .

بهـیە شــاهینی بەلاوە جـوان نەبـوو . ئەو عەیبەکــانی بە ئاســانی ئەبینــی ، و ئەو دەنــگە پــرِ ریــز و نەوازشەشــی لا ناشــرین بــوو ، و هەروەك ئەو تێــڕوانینە بێدەنگە نیگەرانی دەکرد کە تێڕوانینیك بوو بۆ شتەکان و دواجار جیهیشتنیان بوو بە هەڵواسـراوی وەك پـیچەوانەی تیشـکێک لە ئـاودا . رقیکـی زۆریشــی هەبـوو بەرامبەر ئەو لوتەی نەیدەتوانی لە ئاست هیچ شتێکدا بەرزبیتەوە ، دواتر بۆی دەرکەوت کە ئەو ڕەنــگ پینەمـان و پەشـۆکاویەی هۆکـارەکەی ترسـی مـرۆڤە لە شتێک کە خوێن لە پێستیدا نامینیت و دوردەکەوێتەوە .

بهیە شاهین ترسـەکانی بەو پێستە ڕەنـگ پینەمـاوە دەشـاردەوە . بەڵام پێستی بهیە شــاهین فێڵــی لینەدەکــرد . ئەو نــاخی ڕاســتەقینەی دەناســی ، و دەیزانــی چــۆن دەترسیت و لە چ شتێکیش دەترسیت .

بهیەشاهین لە خودی ڕاستەقینەی خۆی دەترسا ، لەو مرۆڤە دەترسا کە لە ناخیدا دەژیا ، ئەو شیتانە دەجوڵیت و بە هەموو توانای بینینـی بۆ شتەکان دەرِوانیت ، و لوتـی بەرزییەکی بی وینەی هەیە تیژ ، وەك تیژی شمشیر ، کەونـی پـی دەکـات بە دوو بەشــەوە و بەرەو پێشــەوە دەرِوات ، بەرەو پێشــەوە بەبــی بەزەیــی ، و دوودڵ نابیــت ، تــا بگــات بە کۆتــایی ، کۆتــایی کۆتاییەکــان ، گەر گیــژاوی کوشندەش بیت .

بەڵام بهیە شـاهین دوودڵ بـوو ، و لە نیـوەدا دەوەستا ، و لە کۆتاییەکـان دەترسـا ، لەبەرئەوەی کۆتــایی لای ئەو کۆتــاییە ، ترۆپکــی بەرزی ترســناکە ، خــاڵی هەڵواسـراوی بۆشـاییە و هـیچ شـتێک لە پـێش و دوای نـیە ، لـوتکەی کوشـندە و دوای ئەو فەنابوون .

لەنیـوەی ڕێگـادا دەوەسـتا ، دەیزانــی کە وەسـتاوە ، بەڵام پـاریزراوە لەو خـاڵی نیوەنـدەدا ، خـاڵی ناوەنـدی گوریســە راکیشـراوەکە کە هەردوو هیـزی راکیشـراو تیایــدا دەبیــت بە دوو بەشــەوە ، خــاڵی ســفر ، هیــزی یەکســانە بە ســفر و

بەرهەڵستیشی یەکسانە بە سفر . بریتیە لە خاڵی بێدەنگی تەواو کە هیچ شتێک هەڕەشەی لیناکات . بەواتایەکی تر خاڵی مردنە .
بهیە شاهین نەیدەزانی لە خودی ناخی مردندا وەستاوە ، و ئەو مەحاڵە مردووە . مێشکی نەیدەتوانی لیکدانەوە بۆ ئەو ڕاستیە بکات . ئەو بەبیرکردنەوە ساناکەی خۆی وا هەستی دەکرد کە رزگاری دەبیت یان لە توانایدا هەیە رزگاری ببیت لە مەترسی بەدورکەوتنەوە لێی ، بە جولە نەکردن بەرەو ژیانی مەترسیدار . مێشکی نەیدەتوانی شیکاری ئەوە بکات کە لە ناخی مەترسیدایە ، و هەر جوڵەیەك جوڵەیە بەرەو رزگاربوون ، بەرەو ژیان ، بەڵام نەیدەزانی چۆن فریای خۆی بکەویت ، و بۆچی خۆی رزگار بکات ، بە واتایەکی تر نەیدەزانی ئامانج چیە لە ژیانی .
کاتێک سەری جوڵاند و ئاوڕیدایەوە بە لاکەی تردا خەندەیەکی کرد ، ئەو خەندە سەیرە . لەو سات وەختەدا نەیبینی . بە دەنگێکی هێمن و لەسەرخۆوە چرپاندی :
- بهیە شاهین ؟
پرسیارەکە بەلایەوە سەیر بوو ، تیکەڵ و پیکەڵی کرد بەڵام هەر زوو هەڵەکەی چاککردەوە ، و ناوەکەی لەسەر پانتاییە سپیەکە بینی ، بە دەنگێکی دوودڵیەوە وەڵامی دایەوە :
- بەڵی .
دەستی بۆ درێژ کردوو تەوقەی لەگەڵ کرد و وتی :
- سەلیم ئیبراهیم .
یەکەمین دەست لەدەستی بئاڵێت . لەپی هیندەی قەبارەی لەپی خۆیەتی و پەنجەکانیشی بەرز و درێژن وەك ئەوانەی خۆی . دەستیکی ڕاستەقینەی لەگۆشت و خوێن ، و بە گەرمایی لەپیدا ئەم ڕاستەی لا رون دەبیتەوە کە لە گەرمی لەپی خۆی دەکات ، و سورِی خوێن لە دەمارەکانیدا لەرینەوەیەکی هەیە ، وەك ترپەی دڵ لەمەچەکدا ، و وەك لەرینەوەی زەوی لەژیر پێیدا ، و هەوا لەدەوروبەری .
بەترسیکەوە کە تەنها لەکاتی هەستکردن بە مەترسی هەستی پیدەکات سەرنجی هەردوو چاوە ڕەشە فراوانەکەیدا ، و چاوەکانی بەهۆی هەمان ترسەوە گەشەیان کرد ، بەڵام خێرا هەستی بەو هەڵەیە کرد ، و قەبارەی چاوەکانی گەڕانەوە بۆ

قەبارەی ئاسایی خۆیان ، و ئەوەی پیاو و ئافرەت پێویستیانە بۆ یەکتر ناسین لە سەدەیەکدا ئەمان لە نیو خولەکدا تییان پەڕاند .
پێی وت :
- دەستخۆشیت لی دەکەم بۆ پێشانگاکەت .
دەموچاوی لە شەرمان سور هەڵگەڕا ، و تیکەڵی کرد :
- هیشتا لە سەرەتادام .
لە پێشانگاکەدا تەنها سی بۆ چوار خوێندکاری لی بوو . بەهەزاران لە کۆلیج بوون ، بەڵام خوێندکارانی کۆلیجی پزیشکی چی بکەن لە پێشانگایەکی وینەیی ؟ تابلۆیەك یان چیرۆکیك یا پارچەیەك مۆسیقا چ سودیکیان پی دەگەیەنیت ؟ هیچ شتێک گرنگ نیە جگە لە توێکاری و دەرخ کردنی وانەکان و و دارِشتنەوەیان لەسەر لاپەڕەی تاقیکردنەوەکان ، کە دواتر لە مێشکدا نامینیت .
لەبەرامبەر یەکتر وەستان لەبەردەم تابلۆیەکدا . باڵای هیندەی باڵای ئەوە ، شانی لە ئاستی شانیتی ، و قۆڵ و مەچەکی وەك هی ئەوە ، و درێژی قاچەکانی وەك درێژی قاچەکانی ئەوە . تەنها ماوەیەکی کورت لیك دوور بوون . ماوەیەك کە ڕێگەیداوە هەوا لە نیوانیاندا بیت و بچیت و جەستەیان جیا بکاتەوە ، ماوەیەك هیندەی باڵای بەڵام باریك وەك تاڵە موویەك . موویەك لەهەوا . هەوا ، هەوا ماددەیەکی جیاکەرەوەیە جگە لە جەستەیان ، و لەبەرئەوەی زۆر باریك و تەنکە ، و زۆر تیژە وەك تیژی شمشیر ، و جەستە لە جەستە جیادەکاتەوە و گۆشت دەبرِیت .
هەمان ئەو سەرسورِمانە دایگرت وەك چۆن لە خەونەکانیدا روودودات ، کاتێک گەورەترین رووداوەکان لە چرکەیەکدا روودەدەن ، و ئەگات بە مرۆڤە بیگانەکان و دەیانناسیت ، و تەوقە لەگەڵ مردووەکاندا دەکات ، و لەهەوادا بە دەست و قاچەکانیەوە دەفرِیت ، و بە مەلە دەچیتە بنی دەریاوە بێئەوەی نوقم بیت و بخنکیت ، و بەسەر گوریسیکی باریکدا دەرِوات بێئەوەی بکەویتە خوارەوە ، و خانوەکان دەرِوخین لە چرکەیەکدا ، و لە چرکەیەکدا دروست دەکرین ، و هەموو شتێک ریی تی دەچیت لە چاوتروکانیکدا .

لەسەر ئەم سەرسورِمانانەی راهاتووە لە خەونەکانیدا ، بەڵام ئەو ئێستا بەئاگایە ، و بە دڵنیاییەوە . ویستی لەو بائاگابوونەی دڵنیا بیتەوە بەڵام نەیتوانی . و هیچ ڕێگەیەکی متمانە پێکراو نیە بۆ دەرخستنی ئەم ڕاستیە دەست لیدانی جەستە نەبیت . بەڵام ئەو لە خەونەکانیشیدا ئەو کارە دەکات کاتێک گومان لە خەوتنی دەکات . و ئەو بیتوانابیە دەیترسینیت ، لەبەرئەوەی ناتوانیت لە هیچ شتێک دڵنیا بیتەوە لە ژیانیدا . هەوڵەکانی بۆ دڵنیابوون زیاتر گومانی لا پەیدا دەکات .
چاوە ڕەشەکانی جیگیر بووە لەسەر لافیتەکە ، لافیتەکەش وەك شەوی تاریك ڕەشە ، چەند خاڵیکی سپی تێدایە وەك ئەستیرە وان ، بەڵام ئەستیرە نین ، بەڵکو هارِاوەیەکە لە ئەڵماس ، بەڵام هارِاوە نیە ، بەڵکو چاوانیکی بچوکن دەبریسکینەوە بە فرمێسکی قەتیسکراو ، چاو نیە ، بەڵکو دوو چاوی منداڵیکی ڕەنگ پینەماوی لاوازە ، بەتەنها دەرِوات بەشەقامەکەدا ، پەنجە بچکۆلانەکانی سورهەڵگەڕاون بەهۆی بەرکەوتنی ڕاستەکەوە ، بیست جار بۆ هەر پەنجەیەك ، بەهۆی جانتا ون بووەکەوە . پیاوە گەورە سمیڵ درێژەکە دەستی گرت و رایکیشا و جانتاکەی لیکەوت ، و بە دەستو قاچە بچکۆلانەکانی لە قاچە گەورەکانی دەدا ، بەڵام ئەوان بە گەورەیی کرابوونەوە وەك دوو دەمی قەدەر ، و ئەو کەوتۆتە نیوانیان لە نزیك دیوارەکە ، لە کونە لوتەکانیەوە دەزولویوك خوێن دیتە خوارەوە دەیسرِیت پێش ئەوەی باوکی بیبینێت . بەڵام باوکی بەو شیوە ڕەنگ هەڵگەرِویە بینی و هەستی بە و خوێنەش کرد ، و دەگەڕا بەشوین برینداریەکەدا لە نیوان قۆڵەکانی ، و نیوان قاچەکانی ، و کاتێک ئەو بازنە خوێنەی بینی لەسەر زەویەکە دەستی بەرز کردەوە و زللەیەکی لیدا .
هەستی بە بریسکەیەك کرد لە چاوەکانیدا ، و ماسولکەیەکی بچکۆلانە لەژێر چاوی چەپیدا دەجوڵا . پاشان ئاماژەی بە تابلۆیەکی تر کرد ، بەڵام بەدەنگێکی کپ لێی پرسی :
- کاتێک منداڵ بوویت دەگریای ؟
سەری سورِماو تیکەڵی کرد . خەونە منداڵیەکانی بەبیر هاتەوە ، و خوداوەندە ئەفسوناویەکە و باوکی ، و پۆلیسەکە ، قوتابخانە ، و قەراغی ڕاستەکە و پەنجە بچکۆلانەکانی . وتی :

- ئەوان لێیان دەدام لەسەر کەسێکی تر کە ناوی بهیە شاهین بوو ، و گویرِایەڵ و عاقڵ .
پێکەنینێکی کورت گرتی ، و سەرنجی تابلۆیەکی تری دا . خوێندکارانی پزیشکی بە عەینەکە ئەستورەکانیانەوە ، پاڵەپەستۆیانە لەدەوری مامۆستایەك عەرەبانەیەکی پێیەو وەك دۆندرمە فرۆش هاواری وانە چاپکراوەکانی ئەکات . و لەبەردەرگای کۆلیجیشدا ئافرەتانیك وەستاون بە ماکسی ڕەشەوە و سەرپۆشی ڕەشیان بە شان و ملەوەیە و لە دوای لاشەیەکەوەن لە توێکاری دەهاتە دەرەوە .
و لە ویستگەی شەمەندەفەریش کابرایەکی نابینا ئافرەتیکی داماو دەستی گرتووە و لە دوایانەوە چەند منداڵیکی شان و مل رووت ئەرِۆن . لەناو کابینە و ژوورەکانی شەمەندەنفەرەکەشەوە ئەو سەر و کەلـلانە هاتونەتە دەرەوە کە وەك دیوی پارە هەموو لەیەك دەچن ، لەسەری کۆلانەکەشدا پۆلیسیکی سمیڵ درێژ وەستاوە .
کاتێک لە تەنیشتی وەستابوو چرپاندی بەگوێیدا :
- بهیە .
شۆڕشێکی تیادا بەرپابوو کاتێک گوییبستی ناوی خۆی بوو ، و ناوی بهیە تایبەتمەندیەکی زۆری وەرگرتووە ، نەك وەك بهیە ، کام بهیە ، بەڵام بیگومان ئەوە ، تەنها ئەوە ، جیا لە ملیۆنان خەڵك ، بە کیانی تایبەتی خۆی ئەوەی کە لە تەنیشتی وەستاوە ، و لە سنوری ئاشکرای جیاواز لە بۆشایی دەرەکی ، و هیڵەکانی دەستی لەسەر لافیتەکە ، شیوەکەی دروست دەکات بە جوڵەی دەستی ، جوڵە خۆویستەکەی کە لە نیو ویستراوەکانی تردا پچرِیویەتی .
بە چواردەوری خۆیدا ئاوڕی دایەوە ، پێشانگاکە چۆڵ بوو بوو تەنها ئەوانی تیادا مابوون ، لەبەرامبەر یەکدا وەستاون ، بێئەوەی بەریەك کەوتبن ، ئەو تاڵ مووە لەهەوا جیایان دەکاتەوە لەیەکتر و ماوەی نیوانیانە . تەنك و ناسکە وەك هەواو تەنها جوڵەی دەستیك ئەپچرِینیت ، و هەر جوڵەیەکی ئاسان بەسە بۆ بڵاوەپیکردن و رەوینەوەی .

بەڵام هیچکامیــان نــاجوڵێن ، وەســتاون وەك دوو پەیــکەری لەبەرد داتاشــراو ، چاوەکانیـان جیگیـرە وەك ئەوەی لە شتێک سـەریان سورِمابیت ، پیسیان سپی هەڵگەڕاوە وەك ئەوەی خوێنی تیادا نەمابیت .
وەك ئەو ترسەی لەخەونەکانماندا هەستی پیدەکەین ، بەڵام ترسیکی ڕاستەقینەیە . هەست بە ڕاستیەکەی دەکات لە ڕێگەی ئەو لەرزینە ستونەی بەجەستەیدا دیت ، و ئەو عەرەق کردنەی ناو لەپی دەستەکانی . و بە جوڵەیەکی بەئاگایانەوە پێی جوڵانـد ، و پاشـان پـیکەی تـری ، و وردەوردە رۆیشـت بەرەو دەرگـاکە . بەڵام دەنگی لە دواوە پەیدابوو :
- بهیە .
وەستا . کەمێـک چاوەکـانی روو لە زەوی کـرد و ، بە دەنگێکـی کـپەوە وەڵامـی دایەوە :
- بەڵی .
- بۆ کوی دەچیت ؟
- نازانم .
- لەگەڵ من وەرە .
- بۆکوی ؟
بە هەسـتیکی نـیمچە تەواوەوە زانــی کە ئەو دەنــگە تەقەی پێڵاوەکـانیتی کاتێـک لەســەر شــەقامە چیمەنتـۆکە دەروات و هەنگــاو دەنیـت . دەنگێکــی ناشــاز نـیە لەگوێیــدا ، وەك نــاوەکەی کاتێــک لەهەوادا زەنــگ دەداتەوە ، بەڵام مێشــکی برِوای بە گویچکەکـانی نیە ، و هەرشـتێک کە لە گوێیدا ئاسـایی بیت لەبەردەم مێشکیدا سەیر دەبیت . باشە ئەبیت چی پێی هێنـابیتە سـەر چیمەنتۆی ئەم شـەقامە ؟ شـەقامیك کە پێشـتر نەیبینیوە ، و یەکێـک نیە لە شـەقامە ئاسـاییەکانی قـاهیرە ، ئەو شەقامە سانـاو ساکارانەی لەمسەر بۆ ئەوسەری بە ئاسانی دەبینیت بە ئاسۆیی ، بەڵام ئەم شـەقامە ئاسـۆیی نیە . بەرەو سـەرەوەیە وەك ڕێگـای ڕۆیشـتن بەرە و چیایەکی بەرز .
بە سەرسوڕمانیکەوە پرسی : ئیمە قاهیرەمـان جیهیشت ؟ کاتێـک گـوێی لە دەنگـی بـوو لەتەنیشـتیەوە زانــی کە بە تەنهـا نـیە ، و هەردووکیـان گەیشـتونەتە کۆتـایی شـەقامی قصـرالعینی و دورگەکەیـان تێپەڕانـدووە و گەیشـتونەتە چیـای مـوقەتەم .

ئەو پێشتر نەهاتۆتە ئەم جێگەیە ، و هەرگیز بە شەقامیکدا نەرِۆیشتووە کە بەرەو چیا برِوات وەك ئێستا ، ژیانی تیدەپەرِی بە هێلێکی ئاسۆیی ، و ماڵەکەیان لە نهۆمی خوارەوە بوو بە چوار پیپلیکانەیەك بۆی سەردەکەوتیت ، و بە پلیکانەیەك یان دووانیش سواری شەمەندەفەر دەبوو ، و تویکاری لە نهۆمی خوارەوە بوو لەسەر زەوی ، و هۆڵی خوێندنی کۆلیجیش کە لە شیوەی پیپلیکانەدا بوو هەر سی پلە بەرز بوو ، و زۆرترین پلیکانە کە سەرکەوتووە بۆ کارگە بووە.

ئێستا ، شتێکی سەیر روو دەدات لە جەستەیاندا لە کاتێکدا لە زەوی دوور دەکەونەوە . کیشی کەم دەکات . وەك ئەوەی لە هەر هەنگاوێکدا شتێک لە قورسایی جەستەیان دابەزیت بێئەوەی هەست بکەن . و دەنگی پێلاوەکانی کەمترە لە جاران ، و قاچەکانی ئاسانتر دەجوڵین ، وەك ئەوەی جەستەییان هەڵنەگرتبیت ، یان جەستەیان قورسایی نەماوە ، و هەوا لە دەوروبەریان بێدەنگە .

لەخۆشیان چەپڵەیەکی لیداو بەدەنگێکی شادیەوە : ( یەکەمینجارە سەرکەوم بۆ موقەتەم ! ) و گوێی لە دەنگدانەوەی ئەو قسەی بوو لە چیاکەوە دەهات . وەستاو سەیری خوارەوەی کرد . بینی شار وەك فەرشیکی سەوز وایەو خانوەکان وەك چوارگۆشەی بچوك وان ، و قاچەکانی لە پێلاوەکانیدایە لەسەر لێواری چیاکەن لە تەنیشتیانەوە دوو قاچی تر لە پێلاویکی رِەشی نائاساییدان .

بە سەرسورِمانیکەوە سەری هەڵبرِی چاوی کەوتە سەر چاوی ، دوو چاوی رِەش تێرِوانینێکی تیژ و سەیری هەیە ، و ماسکەکە لە دەموچاوی دەکاتەوە ، و سەرقاپەکان لەسەر جەستەی لادەدات و دەبینریت ، لایکردەوە بەولادا تەنها ئاسمانی بینی و لەخواریشەوە دۆڵ و نشیو . هەستیکی مەترسیدار دایگرت کە شتێکی بەسەر دیت . و ئەو بەرد و گڵەی ژیر پێی دەردەچیت و دەکەوێتە خوارەوە و جەستەی بەهۆی رِاکێشانی زەویەوە لە هەوادا دەبیتە چەندین پارچە و زەرِرِاتی ورد . وەك چۆن لە خەونەکانیدا بەسەریدا هاتبوو وا هەستی دەکرد گەربیت و بازبدات ئەوا جەستەی رزگاری دەبیت لە چنگی زەوی و دەفرِیت بە ئاسماندا . قاچێکی درێژ کرد و خەریك بوو قاچەکەی تریشی بەریت و باز

بدات ، بەڵام هیزیکی سەیر رایکیشا بۆ دواوە . وایزانی دەستیتی ، بەڵام ئەو لە دووری وەستابوو وەك پەیکەر ، و قۆڵەکانی بیجوڵە ، و چاوە ڕەشەکانی جیگیرە لەسەر چاوەکانی ، و لەویوە دەچیتە خوارەوە بە ناخیدا ، و ناخی قوڵ و شاراوەی دەبینیت ، هەروەها ئەو ترپە خێرایە ، وەك ترپەی کەون لە بێدەنگی و کشی شەودا ، ئەو جوڵە شیتانەیەی لە دوو تویی ناخیدا شاردویتیەوە ، و ناخی چین بە چین تیوەی ئاڵاوە تا نەبینراو بیت و جوڵەکەی بۆ هەتایی نهێنی بیت .

دەموچاوی سپی هەڵگەڕا و ڕەنگی پینەما ، و پەنجەکانی سارد بوون وەك کلۆ بەفر ، و چاوەکانی لە جوڵەیەکی فێڵاویدا لیکنا وەك چۆن لە خەونەکانیدا وایدەکرد ، پاشان کردنیەوە ، و زانی کە خەون نابینیت ، و چاوە ڕەشەکان لە چاوانیدان ، و ڕەشیەکە ڕەشیکی تەواو نیە ، و کەمێک بەلای شیندایە ، شینیکی قوڵ ، وەك شینایی ئاسمان کاتێک لێی ورد دەبینەوە ، و وای دەبینین وەك ئەوەی بوونی نەبیت ، و جەستەمان میرولەیەك دەکات ، هەست دەکەین کە ئیمە لەبەردەم گەورەیی کەونداین ، گەورەییەکی ترسناك ، گەورەییەکی بێدەنگ ، بێدەنگیەکی ترسناك ، لەبەرئەوەی بێدەنگیەکی ڕاستەقینە نیە بەڵکو لە ژیریەوە جوڵەیەك هەیە ، جوڵەیەکی شاراوەی نهێنی خێراییەکەی چاو هەستی پیناکات .

دەموچاوی بە لەپەکانی دەستی شاردەوە و هاواریکی نەبیستراوی لی بەرز بووەوە :

- سلیم .

بەدەنگێکی کپەوە وەڵامیدایەوە : بەڵی .

- من دەترسم .
- لەچی دەترسیت ؟
- لە مردن .
- مردن بوونی نیە .
- بەڵام من دەترسم .
- لە ژیان ؟
- بەڵی .

هەرکەسێک لەو کاتەدا بیبینێت هەست دەکات هەڵدەلەرزیت . ترسەکەی وەك ئەو ترسە نەبوو کە خۆمانی لی بەدوور دەگرین ، بەڵکو ترسیکی ترە و لە

مەترسی نزیكمان دەكاتەوە زیاتر لەوەی كە دوورمان دەخاتەوە . حەزیكی بە لیشاو بۆ هەستكردن بە مەترسی تا لوتكە ، تا كۆتایی ، دوا كۆتایی كە بۆ هەتایی رزگارمان بكات لە دەستی . وەك بار گرانیەك كە بەسەر جەستەوەیەتی لەو كاتەوەی كە جەستەی بۆ دروست بووە . لەو كاتەوەی لە كەون جیا بۆتەوە و لە جەستەی دایكی جیاكراوەتەوە لە تۆپەڵیكی دەستنیشانكراودا ، زەوی بۆ خۆیی ڕادەكێشێت ، و ئاسمانیش بۆلای خۆی ڕاپێچی دەكات و هەوا لە هەموو لایەكەوە پەستانی دەخاتە سەر ، و جەستە بچكۆلانەكەی بەردەوام لە چنگی كەوندایە .، لە نیوان دوو شەویلگەی شیردا ، و دەیزانی كە شەویلگەی سەرەوە هەر ئەبیت بیتە خوارەوە بۆ سەر شەویلگەی خوارەوە . و گەر گومانی هەبیت لەم ڕاستیە ئەوا دەبیت بیر لە هەڵهاتن بكاتەوە بەهەر ڕێگایەك بیت . بەڵام ئەو ڕاستی لەسەر جەستەی هەڵگرتبوو لە هەر خانەیەكدا كە ترپە و لیدانی تیادا بیت دەیزانی كە ئەو سات وەختە لە هاتندایە ، و ئەو ترپە و لیدانە دەوەستیت ، و لە زۆری هەست كردن بەو ڕاستیە حەزی دەكرد ئەو ساتە بیت و ترپەی تیادا بوەستیت و لە كۆڵ ئەو بار گرانیە بیتەوە .
بە دەنگێكی كپكراوەوە وتی :
- لە ئامێزم بگرە تا ...
وەستاو قسەی بۆ نەكرا . ئەیویست بلی تا ترپەكە دەوەستیت . بەڵام حەزی شاراوەی بۆ مردن بە ئاشكرا بووە حەزیكی قەدەغەكراو ، و رونتر تیگەیشت كە بۆچی خەڵكی حەزە ڕاستەقینەكان قەدەغە دەكەن و حەزە نا ڕاستەقینەكانیان هەست پیدەكەن و ڕێگە دەدەن .
تەنها جوڵەیەكی بەس بوو تا پێی بگاتە كۆتایی ، بەڵام ئەو دەترسا لە گەیشتن بە كۆتاییەكان . هەست بە مەترسی گەیشتن و مەحاڵی گەڕانەوە دەكات بۆ ئەو جیگەیەی لێی بووە ، و ئەو بە ڕێگەیەكی تری سحراوی دەبیتە مرۆڤیكی تری جگە لە بهیە شاهین ، بە واتایەكی تر دەبیتە خودی ڕاستەقینەی خۆی .
لیوەی دوور بوو ، بە هەنگاوە خێرا فراوانەكانی دەرۆیشت ، چاوە ڕەشەكانی بۆ سەرەوە ، ڕەشیەكانیان ڕەشی تەواو نیە ، و هەروەها لوتی بە پلەی پێویست بەرز نیە ، و پێستیشی سپی هەڵگەڕاو بوو لە ئەنجامی ئەو ترسەی كە مرۆڤ هەوڵدەدات بیشاریتەوە .

دەنگی لە پشتەوە بیست :

- بهیە .

نەوەستا و وەڵامیشی نەدایەوە . بە دەنگێکی بەرزتر بانگی کرد دەنگیدایەوە لە چیاکەدا :

- بهیە .

خێراتر رۆیشت و لە دەنگەکە دوور کەوتەوە ، بەڵام لە هەموو لاکانەوە چواردەوری گرت ، و بە دەستی گویچکەکانی گرت ، بەڵام دەستی لابرد لەسەر گویچکەکانی و بە دەنگێکی بەرزی تووڕەوە هاواریکرد :

- بۆچی دەرِ ۆیت ؟

ویستی بجوڵێت ، بەڵام قۆڵی درێژ کرد و ڕێگەکەی لیگرت ، بە هەموو توانای پاڵی پیوەنا بەڵام رایکیشا بۆلای خۆی ، بە دەستی دەموچاوی بەرز کردەوە ، و چاوەکانی برِ یە چاوی ، دوو چاوی تووڕە ، ڕەشیەکانیان شینیکی تاریکی ترسناکی تیکەڵە وەك شینایی دەریایەکی بی بن ، ویستی سەری بجوڵێنیت بۆ لایەکی تر بەڵام بە دەستی سەری گرت و نەیهیشت و بە دەنگێکی بەرزی تووڕەوە وتی :

- بهیە شاهین وات لێدەکات هەرگیز نەتوانیت بگەیتە لوتکە ، و بەردەوام لە نیوەی ڕێگادا دەژیت و دواجار دەکەوێتە گۆرِ ی ڕۆژگارەوە وەك ملیۆنان .

دەنگی دەنگدانەوەیەکی سەیری هەبوو . دەستی بەردا کەوتە سەر سنگی و لەرینەوەیەکی دروستکرد ، و چاوەکانی دەلەرینەوە ، و هەموو شتێک لە ژیانیدا وایلیهاتووە ئەلەریتەوە . ئەم دەنگدانەوەیەی جارێکی تر گوی لیبووە . بەڵکو دووجار ، چەندین جار ، بەڵکو هەموو ڕۆژێک کاتێک کە لە شەمەندەفەردا دادەنیشت و ئەو مرۆڤانەی دەبینی کە لە دیوی پارەیان دەکرد ، و کاتێک خوێندکارەکانی بە عەینەکە سپیەکانیانەوە دەبینی و سەریان شۆرِ کردۆتەوە بەسەر کەشکۆلەکانیاندا ، کاتێک خوێندکارە کچەکانی دەبینی بە چاوە ماتەکانیانەوە و قاچە پیکەوە نوساوەکانیان ، کاتێک گوێبیستی وانەکان دەبوو گوێی لەو دەنگە دەبوو ، و کاتێک زەنگی کاتژمێرەکە هەموو بەیانیەك لێیدەدا

هەمان ئەو زەنگەی جاران بوو ، و باوكیشی بە هەمان دەنگەوە بانگی دەكرد ، و هیچ شتێک نیە ئەم شتانە بۆ هەتایی ببرِێت .

حەزیكی شیتانەی هەبوو بۆ كۆتایی هێنان بەم شتانە . حەزیكی زۆر بۆ هاواركردنیكی گەورە ئەم شتانە بپچرِێنیت . حەزیك بۆ بازدان لە پەنجەرەكەوە و شكاندنی دەست و قاچەكانی . حەزی چەقاندنی چەقۆی چیشتخانە بۆ سنگی و هاواركردنی لە ئازاردا هاواریكی وا كە خۆی گوێی لیبیت و هەست بكات بە متمانەوە كە زیندووە و نەمردووە . حەزیكی كوشندە بۆ هەستكردن بە ژیان بە ریژەی ئەنجامدانی تاوانیكی كوشتن . بە كوشتنی جەستەی بە تەواوەتی و لە تەواوی ویست و ئارەزویدا . ئەو دەیزانی كە تاوان نیە ، بەڵكو تاوان ئەوەیە كە جەستەی بكوژیت بەبی ویستی خۆی .

دەیزانی كە بەڕاستی ویستنیكی تر هەیە خۆی بۆ مەڵاسداوە . و لە فرسەت دەگەرِی ، هەر فرسەتیك ، بۆ لەناوبردنی ، وەك هەڵخزانی قاچی لە پلیكانەكانی شەمەندەفەر ، یان داڵغە داگرتنی لەكاتێكدا كە لە شەقامەكە دەپەرِیتەوە ، یان لیدانی فیشەكیكی ویڵ بە هەڵە .

مردنی بەم شیوەیە ، بە ریكەوت و بی ویستی خۆی ، دەبیتە تاوانیكی نا مەشروع . ئەوەی وادەكات كە مردن مەشروع بیت ئەوەیە كە ئامانجەكەی دیاریكراوبیت ، دەستنیشانكراوبیت لە هەردوولاوە .

كاتێک سەری بەرز كردەوە لەسەر سنگی نەیبینی . بە خێرایی ئاوڕیدایەوە بۆ دواوە، بینی خەریكە پشتی لە كۆتایی شەقامە لول پیچە لیژەكەدا ون دەبیت . بە دەنگێكی بەرز هاواریكرد :

- سلیم .

بەڵام وەڵامی نەدایەوە . زیاتر دەنگی بەرزكردەوە و بانگی كردەوە :

- سلیم .

چەند جارێک بانگكردنەكەی لە چیاكەدا دەنگیدایەوە ، بەڵام كەس وەڵامی نەبوو .

لەسەر جیگاكەی خۆی لە ژووره بچكۆلانەكەیدا راكشابوو ، و چاوە ڕەشەكانی لە تاریكیەكەدا بریسكەی دەدایەوە وەك دوو پارچە ئەڵماس ، ڕەشاییەكانیان

دەمـژی و پاشــان دەریانــدەدایەوە لەشـیوەی تیشــكێكی سـپیدا ، و بە ملیۆنــان لە زەرِرِات لە تیشــكەكەدا مەلە دەكەن و دەخــولینەوە لە جــوڵەیەكی بــازنەیی نەگــۆرِدا وەك ســـورِانەوەی كەونـــی ئەبەدی ، وەك جـــوڵەیەكی جیگیـــر لە گویچكەیدا دادەبەزیت بۆ گەردنـی و سنگی و بە قاچەكانیدا دەچیتە خـوارەوە و میرولە دەكات وەك سورِی خوێن ، و دەرِژیتە لەپەكانی و قاچەكانی و لە هەر بیسـت پەنجەكانیـدا كـۆدەبیتەوە وەك سـەری دەرزی دەبـوس . وەك قاچەكـانی میـرولە ورد لەژیـر پێستەوە و سـەر ئێسـكەكانی دەرِوات و خەریـكە گـوێی لە زیكەزیكیـان دەبیت . وەك ملیۆنـان لە دەنگـی كپكراوە كە بێدەنگی شـەو دروست دەكەن .

جەستەی لەسـەر جیگاكەی لادا ، و قـاچە رووتەكـانی بەر زەویە ساردەكە كەوت ، كەمێــك پلیــداو گەر قــاچ و ئێســكە درێــژ و پتەوەكــانی نەبــوایە دەكەوت ، جەســتەیان بەرِیكــی بەرز كــردۆتەوە ، بەو دەســت بەســەراگرتنە بەهیــزە بـۆ یەكســان راگیركـرد ، و رِۆیشـتن بەسـەر زەویـدا بەهەمـان ئەو هەنگـاوانەی كە جیگیـرن و كەون دەكەن بە دوو بەشــەوە ، وەك كەشـتیوانیكی سـەلیقە كە توانـای گرتنی چارۆكە پتەوەكانی كەشتیەكەی هەبیت .

تـابلۆكەی لە پشـت جـیگەكەیەوە راكیشـا ، و تیشـكی گڵـۆپەكەی خسـتە سـەر و لەبەرامبەریدا لەسەر زەویەكە دانیشت ، لەو زەرِرِاتە وردانە ورد دەبوەوە كە لە تیشكی گڵۆپەكەدا مەلەیـان دەكرد ، كـاتێكیش كە پەستانی خستە سەر فلْچەكە هەستی بە سـەرە دەرزیە دەبوسـەكان كـرد لەژیـر پێستیەوە ، و لەهەر پەستانیكدا هەستی بە تیهەڵچـوونی دەرزیەكـان دەكـرد ، بەڵام دەسـتی نەدەوەسـتا لە جـوڵە ، دەهـات و دەچـوو بەو جـوڵە ویسـتراوەوە لەسـەر تـابلۆكە ، بەو حەزە تونـدەوە بـۆ هەسـتكردن بە ئــازار تاكۆتــایی ، لە پەســتان كــردن لە پەنجەكــانی تــا خوێنیــان بەردەبیت و لەناو دەچن و ئازار كۆتایی دیت .

حەزیكی توندی بەلیشـاو ، جەستەی ئەهەژینیت ، زەوی ئەهەژینیت لە ژیریـدا ، و لە پەنجەكــانیەوە دەچیــتە قۆڵەكــانی و بــۆ گەردنـــی و ســـەری وەك وایەریكــی كارەبـایی راكیشـراو ، و پەنـجە و گەردنیشـی تونـد دەبـن ، و سـەری جیگیـر و ناجوڵیت .

هەركەسێک لەو كاتەدا بیبینێت واهەست دەكات لەخاچ درابیت ، و گەر بەهۆی جوڵەی دەستیەوە نەبیت وادەزانیت مردووە ، یان نوستووە و داشنیشتووە . بەڵام ئەو بەئاگایە و زۆریش بەئاگایە . چاوە كراوەكانی وردترین هێڵەكان دەبینیت ، و خاڵەكان و پەنجەكانی یەكدەگرنەوە لە سەری فلْچەكەدا و دەتوانیت كەون شەق بكات بە هێڵیكی باریكی سپی ، وەك هێڵی ئاسۆ كە زەوی و ئاسمان لیك جیادەكاتەوە ، و هەروەها ڕۆژ و شەو ، هێڵیكی سپی تیكەڵأ بە سوورایی ، سوریكی تاریكی لە ڕەنگی خوێن .
چاوەكانی كاتێک ئەو ڕەنگە سورە تاریكە بەدی دەكات فراوان دەبن ، وەك ترسی چاوەكان لە بینینی خوێنی ڕاستەقینە . چ شتێک دەیترسینیت لە ڕەنگی خوێندا وا لێی ورد دەبیتەوە لە دەمارە شینەكانی ژیر پێستیدا ، و هەست بەو ترپەیە دەكات لە مەچەكیدا ترپە لەدوای ترپە ، و بە هەستیكی ئاڵۆزی شاراوە وا دیت بە خەیاڵیدا كە ترپەی داهاتوو دوا ترپە دەبیت ، و دەنگەكە دەپچڕِیت ، و هەناسەكانی دەگریت و و گوێی لە بیستن دەكەوییت ، خەریكە پێشوازی لەو ساتە دەكات بی ترپە ، بەڵام گویچكەكانی هەر زوو گوێبیستی ترپەكە بوون ، شاراوە و دووبارە بوونەوە بەهەمان جوڵەوە ، وەك ترپەی پێشوو ، و وەك ترپەی داهاتوو ، وەك زیكەزكی بەردەوام لە گویچكەیدا ، و زۆر حەز دەكات بپچڕِیت و كۆتایی پی بیت ، و بەوپەڕِی هێزیشەوە چاوەڕِیی ترپەی داهاتووە و دەترسیت نەیەت .
لە بەیانیدا چاوەكانی بە زەنگی كاتژمیرەكە دەكاتەوە ، چاوە گەورەكانی باوكی لەسەر جیگاكەیە ، و رایدەكیشنە دەرەوەی جیگاكە ، و دەرەوەی ژوورەكەی ، و دەرەوەی ماڵەوە و سەرنجی دەدەن لە ناو شەمەندەفەردا ، و لە كۆلیج و ، بە لەپی دەستیشی پاڵی پیوە دەنیت بۆ چوونە ژوورەوەی هۆڵی توێكاری .
لە نزیكی میزەكەوە دەوەستیت و قاچێكی بەرز دەكاتەوە بۆ سەر لێواری میزەكە ، وەستانیك كە هیچ كچیك نەیدەتوانی لەو سەردەمەدا بەو شیوەیە بوەستیت ، و تەنانەت كوڕانیش .
تەنها كەس كە دەیتوانی دكتۆر علوی بوو ، لە نیوانی میزەكانەوە بە عەینەك و سەدریە سپیە كورتەكەیەوە دەهاتو دەچو ، و لە نزیك میزەكەی ئەو دەوەستا ، و پێیەك لەسەر میزەكە و پێیەك لەسەر زەوی لە تەنیشتیەوە ، و چاوە شینەكانی لە

پێش چاویدا دەبوون . بەڵام چاوەکانی ئەو بۆ بەرزییە و بۆ پێشەوەیە ، و لە هەوادا ولە بۆشاییدان وەك ئەوەی بەدوای شتێکدا بگەڕێن ، و ملیۆنان لە بونەوەرانی زەڕڕاتی مەلە کردووی ناو کەون ئەپشکنن ، و بەدوای روخساریکی ئاساییدا دەگەڕێن لەنیو هەزاران کۆمەڵی لیکچوو بەدوای ئەو دوو چاوەی لێی دەڕوانن و بەهۆیانەوە بینراو دەبیت . ئەو دوو چاوە ڕەشەی لە نیوان هەموو دەموچاوەکاندا دەیدۆزنەوە و جەستەی لەنیو ملیۆنان جەستەی ون بوودا هەڵدەگرنەوە .

بەڵام دەموچاوەکان هەموو لەیەك دەچن لە بەشی توێکاری ، و لە شەقام و ، لە شەمەندەفەردا ، و لە تارمەی فراوانی قەرەباڵخی کۆلیجیش ، واهەستی دەکرد کە بەتەنها لە دەریادا نوقم دەبیت ، بێئەوەی کەس بیبینێت ، و بێئەوەی هیچ کەسێک بیناسیتەوە ، و دەموچاوی وەك دەموچاوی هاوڕێکانی لیهاتووە ، و جیاوازی نیە لە نیوان بهیە و علیە یان سوعاد یا ئیفۆن . و بێئەوەی هەست بکات هەڵدیت و رادەکات و خۆی لەو گیژاو و تەنگەژەیە دووردەخاتەوە بۆ روکنیکی داخراو و دەبڕاوی کۆلیج لە پشتی تەلارە زەبەلاحەکەوە . و لەسەر کورسیە تەختە بی پشتەکە دادەنیشیت ، ئەچەمیتەوە بۆ پێشەوە ، و لە پارچەیەك زەوی ورد دەبیتەوە هیندەی لەپی دەستی ، هیچ گیایەکی لی سەوز نەبووە ، بەدەر لە هەرچوارلای تری زەویەکەی دەوروبەری هەر بە خۆڵ و قوڕی ماوەتەوە ، قلێشاو ، و لە نیوان قلێشاویە گەورەکانەوە بە ملیۆنان لە بونەوەرانی وردو ئاڵۆز دین و دەچن لە قەبارەی میرولەدا .

بهیە ! دەنگی ناوەکەی لە گوێیدا وەك زەنگ دەنگیدایەوە وەك ئەوەی ناوی کەسێکی تر بیت ، و لەسەر کورسیەکە راپەڕی . بینی دوو چاوی ڕەش لەپێش چاوین ، و ماسکەکەی لادەدەن و بەرگەکەی لیدەکەنەوە ، و بی هیچ بەزەییەك بەرە و ناخی قوڵی تەسکی دورودرێژی دەچن ، و تەنها ساتیکی تر بەسە تا بگاتە کۆتایی .

بەڵام بە دەنگێکی کپکراوەوە وتی :

- سلیم .

بە وەستاوی و بێدەنگی لەبەردەمی مایەوە . لێی ورد دەبوەوە :

- دوێنێ بۆ جیتهیشتم ؟

چاوەکـــانی لەســـەر جیگیرکـــردووە و نـــاجولێن . و دەموچـــاوی بە دەســـتەکانی شاردەوە و دەستی کرد بە گریانیکی بەرز کە دەبیسترا .

بەدەنگێکی وەك چرپە لێی پرسی :

- بۆچی دەگریت ؟

وتی :

- تۆ وەك پێویست خۆشت ناویم .

وتی :

- تۆ هیچ کەسێکت وەك پێویست خۆشناویت . وەك مردن لە خۆشەویستی دەترسیت و لە نیوەی ڕێگەدا دەوەستیت ، ئەمەیە بهیە شاهین .

هاواریکرد :

- نـــــــا .

دەستەســـڕە ســـپیەکەیدایە فرمێســـکەکانی ســـڕِی . چـــاوە ڕەشـــەکانی لە تیشـــکی خۆرەکەدا پرشنگی دەدایەوە و پیکەنی .

لێی پرسی :

- دوێنێ شەو چیت کرد ؟

وەڵامیدایەوە :

- هیچ شتێک .

لێی پرسی :

- هیش شتێکی نویت وینە نەکیشا ؟

وتی :

- نەخێر .

کەمێک بێدەنگ بوو و پاشان لێی پرسی :

- ئەی ئەمشەو چی ئەکەیت ؟

بە دەنگێکی کپکراوەوە وتی :

- نازانم .

دەستی کرد بە گیرفانیدا و کلیلیکی بچکۆلانەی دەرهێنا . دایە دەستی و پێی وت :

- ئەمە كلیلی شوققەكەمە لە موقەتەم . لە دوای كاتژمیر سیوە هەركاتێك دێیت وەرە . چاوەڕ ِوانتم .

*     *     *

بەخێراییەكی زۆر لە پشت بینای كۆلیجەوە ون بوو ، و ئەو هەر وەك خۆی لە جیگەكەی خۆیدا بە وەستاوی مایەوە . پەنجەكانی لە شتێكی كانزایی بچوكەوە ئالاوە ، سەرەكەی بازنەییەكی نەرمە و لە ناوەڕاستیدا كونیك هەیە ، و كلكەكەی ددانی وردی پیوەیە ، و بە سەری پەنجەی دەستی لیدا هەستی بە وروژاندنیك كرد ، وەك دەنكە زیخ و لمی وردی گەرم ، بە قۆڵەكانیدا دەر ِوات بۆ قاچەكانی و لەویوەسەردەكەوێتەوە بۆ گەردنی و قۆڵەكانی و كۆ دەبوەوە لە لەپیدا لە دەوری ئەو شتە بچكۆلەیەیەی ناو دەستی .

وەك كلیلی هەر دەرگایەكی تر ، بەڵام دەیزانی كە شتەكان دەگۆر ِین بە گۆر ِانی هەستەكانی ، و كلیلیكی كانزایی بچوك لەوانەیە لەپر ِ ببیتە كلیلیكی زەر ِر ِی یان سحری . و هەواو و تیشك لەچواردەوری دەجولێنێت لە لەرینەوەیەكی بازنەییدا ، و لەسەر جەستەوە وەك میرولەكردنی ساردی گەرمیەك دایدەگریت ، و لەسەر لەپی دەستی رادەكشیت پر ِ بە لەپیتی ، و درێژە لە قۆڵی درێژترە ، وەك درێژی درەختیت لە ئاسماندا ، یان زەوی راخراو بە پانتایی بینینی چاوەكان .

هەستی بە تنۆكە عەرەق كرد لە لەپی گەرمی دەستیدا لەژیر ئەو تەنە رەقەوە و كاتێك لێوارەكانی پەنجەی بەردەكەویك ساردە وەك بەفر . لە دەستەسڕە بچكۆلانەكەیەوە پێچا ، و خستیە گیرفانیەوە ، و بەچەند هەنگاوێكی پڵنگ ئاسای خێرا لە كۆلیج دوركەوتەوە . و چاوەكان لە هەموو لایەكەوە تەكیان پی هەڵچنی و دەستی خستەسەر گیرفانی تا بیشاریتەوە ، وەك ئەوەی كە ئەو كلیلە توانای ئەوەی هەبیت دەستەسڕەكەی و گیرفانی ببر ِیت و ببینریت وەك خۆری ئاشكرا .

*     *     *

و بێئەوەی هەست بكات پەستانی خستەسەر گیرفانی ، و بەرەو دەرگای كۆلیج ڕۆیشت ، بەڵام دەنگێكی بیست بانگی دەكرد :
- بهیە .
ئاوڕیدایەوە دكتۆر علوی بینی بە چاوە شینەكانیەوە و چەند هاوڕێیەكی لەگەڵدابوو و بە دەنگێكی مامۆستیانە پێی وت :
- بهیە ، ئەوە لەكوی بوویت ؟ من بۆت دەگەڕام .
كەمێک شڵەژا و وتی :
- لە ژووری خوێندكارەكان بووم .
بە دەنگێكی وەك فرمان پیكردنیك وتی :
- تا ژوورەكەی من پینج خولەكیك وەرە .
هاوڕێیەكی بە گوێیدا چرپاندی :
- بە ڕاستە لە پەنجەكانت دەدات .
یەكێكی تریان دەستی بە دەمیەوە گرت بە پێكەنینەوە وتی :
- بە نەشتەر هەڵت دەدڕێت .
یەكێكی تریان ملی هێنایە پێشەوە و وتی :
- پارچەپارچەت دەكات .
یەكێكی تریان هەناسەیەكی هەڵكیشاو وتی :
- خۆزگەم بەخۆت بریا من بومایە .
هەناسە هەڵكیشان ، هەناسە دانەوە ، و ئای و ئۆی و دەنگی لیرەو لەویی شاراوە لە جەستەدا وەك ڤایرۆس ، دەیەوێت جەستە هەڵوەشینیت ، و پارچەپارچەی بكات كە هیچی نەمینیت .
لە دوایەوە چووە ژوورەكەی . سەدریە سپیەكەی داكەند هەروەها عەینەكە سپیەكەشی، و ماسولكە پتەوەكانی مامۆستا لە وەرزشەوانی دەكرد ، و جەستە ریك و پیك ، و پێستی سپی و سور وەك ئەوەی خۆر سوری كردبیتەوە ، چاوە شینەكانی فراوانیان زیاتر بوو وەك ئەوەی لە شتێک سەریان سوڕمابیت .
- بهیە ئەم ماوەیە چیت لی بەسەر هاتووە ئەو بهیەیە نەماویت كە ناسیومانە .

پەشــۆکا وەك ئەوەی جلــوبەرگەکەی دانابیــت و بەشــیکی تــایبەتی جەســتەی مامۆسـتای بینیبیـت ، شـتێک کە لە چاوەکـانی شـاردبیتەوە ، و تەنهـا بـۆ خـۆیی پاراستووە . و ئیخەی بلوسەکەی کەمێک راکیشاو بە دەنگێکی توڕەوە وتی :

- من وەك ڕۆژانم .

و بە زمانیکی مامۆستایانە و پرِ متمانە بەخۆی و بەبێدەنگی وەڵامی دایەوە :

- ئەی خۆ دزینەوەت لە توێکاری ؟

وتی :

- من سەرقاڵی پێشانگاکە بووم .

وتی :

- نـــا بهیە ، پێشانگاکە نیە ، تۆ سەرقاڵی شتێکی تریت .

لە تــوڕەیی و سەرســورِمانــدا لیوەکــانی کــرانەوە بەڵام هەرزوو شــاردیەوە و لایکـردەوە بـۆ دەرگـاکە تـا بچیـتە دەرەوە ، بەڵام ڕێـگەی لیگـرت ، و بە زمـانی مامۆستایانە پێی وت :

- تۆ سەرقاڵی شتێکی تریت بهیە .

سەیریکی چاوە شینەکانی کرد و بە متمانە بە خۆوە وتی :

- نەخێر .

وەك ئەوەی گوێی لە وەڵامەکەی نەبوبیت بە دەنگێکی هێمنانە لێی پرسی :

- بهیە چی سەرقاڵی کردوویت ؟

جارێکی تر وەڵامیدایەوە :

- هیچ شتێک .

شـتێک هەیە لە نیـوان ئەو و دکتـۆر علویـدا ، شـتێکی نادیـار و نەزانـراو ، بەڵام بـوونی هەیە و هەسـتی پێکـراوە . هەسـتی پـی دەکـات لە چـاوە شـینەکانیدا کاتێـک سەیری دەکات ، و لە دەنگیدا کاتێک قسەی لەگەڵ دەکـات ، و هەنـدێک جـار بیـر لەو شـتە دەکــاتەوە ، ئەبــی چــی بیـت . بەڵکـو لەوانەیە جارێـک لە خەونەکانیـدا بینیبیتی . کراس و پـانتۆڵیکی لەبەردابوو ، و جەسـتەی جـوان بـوو وەك گەنجیکـی وەرزشی ، و قۆڵەکانی توکن و سورهەڵگەڕاو بە تیشکی خۆر ، بەرزی کـردەوە ویسـتی لە ئـامێزی گریـت خـۆی دەربـازکرد . تـوانی بە قۆڵەکـانی ببیەسـتیتەوە و دەسـتی لەسـەر لیوەکـانی لاببـات و مـاچی بکـات . و هەسـتا لە خەو ئەو هەر

بەردەوام بوو لە ماچ کردنی ، و کاتێک بە دەستەکانی پاڵپیوەنا و کەسی نەبینی هەستیکرد کە خەون دەبینیت . و پێی سەیر بوو چۆن دکتۆر علوی خۆی دەسەپینیت بەسەریدا لە خەونەکانیدا ، لەگەڵ ئەوەی لەکاتی بەئاگاییدا هیچ حەزیکی بۆی نیە ، بەڵکو قینی لێیەتی . قینی لە چاوە شینە داگیرکەرەکانیتی ، و قینی لە پێکەنینەکەیەتی . لەبەرئەوەی وەك خەڵکی پیناکەنیت بەڵکو پێکەنینێکی مامۆستایانەی ناشازی بی پچرِاندنی دەستکردی هەیە . بەردەوام هەستیکی وایان دەداتی کە ئەو مامۆستایە ، ئەوەی ئەو دەیزانیت ئەوان نایزانن ، و ئەوەی ئەو هەیەتی ئەوان نیانە ، و جوڵەی قاچەکانی لە کاتی هاتن و چوندا جوڵەیەکی برِوابوون بەخۆیە و پرِ حەوانەوەیە .
کەلەکەی لە پشتەوە دەرچوو بوو بەهۆی دایشتنی زۆر لەسەر کورسی . دەستە توکنەکەی لەسەر گیرەی دەرگاکە بوو ، دەستەکەی تری لەسەر شانی ، چەند جارێک دای بەسەر شانیدا وەك چۆن مامۆستاکان دەدەن بەسەر شانی خوێندکارەکانیان ، بەڵام دەستی لەسەر شانی راگیرکرد و کەمێک شانی گوشی و بەدەنگێکی جۆریکەوە وتی :
- بهیە تۆ دەزانیت من گرنگیت پیدەدەم ..
خێرا زمانەکەی گۆرِی بۆ زمانی مامۆستایانە و دەنگی نەرم کردەوە :
- تاقیکردنەوەکان نزیك بونەتەوە ، بەلامەوە گرنگە دەربچیت .
لە ویستگەی شەمەندەفەرەکە سەیریکی کاتژمیرەکەی دەستی کرد : سی و نیو بوو ، دڵی لیدانیکی بەرز لێیدا ، و دەستی درێژکرد بۆ گیرفانی هەستی وەرگرت . سەری پەنجەی بەر رووە کانزاییەکە کەوت بە ترسیکەوە دەستی دوورخستەوە وەك ئەوەی بۆمبیلك لە گیرفانیدا بیت ، هەر کە دەستی لیبدات بتەقیتەوە ، کە تەقیشەوە جەستەی پارچەپارچە دەبیت و لەسەر چیمەنتۆکە بڵاودەبیتەوە . و شەمەندەفەرەکە بەپرِی هات و زۆر قەرەباڵخ بوو ، خەڵکەکە دوورکەوتنەوە تا کەس نەبیت بەژیرەوە . پەشیمان بوەوە لە سواربوونی شەمەندەفەر و برِیاریدا بەپی برِواتەوە بۆ ماڵەوە .
شەقامی قصر العینی تێپەرِاند و بەرە و شەقامی نیل بەرِیکەوت . خۆر تیشکەکانی خستبووە سەر رووی ئاوەکە ، و هەواکەش گەرم و پاراو بە هێمنی

لە روخساری دەدا . و پیڵوەکانی لەو بەرکەوتنە ناسکەدا لیکنا . ڕێگای رۆخی نیل لەبەرئەوەی نیوەرِۆ بوو چۆڵبوو ، پەنجەرەی ماڵەکان داخرابوون و هیچ کەسێکی نە لە پێشەوە نە لە دواوە نەبوو ، و بەرکەوتنی پێی بە چیمەنتۆکە و لە گوێیدا دەنگدانەوەیەکی ئاسایی و رۆتینی وەك جارانی هەبوو . بەڵام ئەوەی کە لە گویچکەکانیدا ئاسابییە لە مێشکیدا دەبیتە جیگای گومان ، و ئەو تەقە و بەرکەوتنی چیمەنتۆیە بەرکەوتنی پی نیە ، بەڵکو بەرکەوتنی پێی کەسێکی ترە لە پشتیەوە . ئاوڕیدایەوە کەسی نەبینی . هەستی بەشتێک لە بی هیوایی کرد . وەك ئەوەی چاوەرِوانیکردبیت ، یان وەك ئەوەی ژوانیکیان هەبوبێت و نەهاتبێت . لە هەمان کاتدا دەیزانی کە لە پشتیەوە نیە ، و بەڵکو لە شوققەکەی لە موقەتەم چاوەرِوانیتی ، لە هەر کاتێکدا لە دوای کاتژمیر ( سێ ) وە .

بە تیلەیەکی چاو سەیریکی کاتژمیرەکەی دەستی کرد . چارەکی ئەویست بۆ چوار . دڵی پرتەیەکی کتوپرِی کرد ، و چاوە ڕەشەکانی برِیە ئاسمان ، و دەموچاوە درێژەکەی ڕەنگی تیادا نەمابوو پەشۆکاو بوو ، قژە درێژەکەشی بەبڵاوی بە گەردن و سەر گویچکەکانیدا هاتبوە خوارەوە ، دەفەی شانەکانی لەژێر بلوسەکەیەوە چەماوەییەکی پیوە دیاربوو ، مەمکە بچوکەکانی لەگەڵ هەناسەکانی دەردەکەوتن و ون دەبوون ، پەنجە سورهەڵگەڕاوەکانیشی ئاڵابوە جانتا چەرمە هەڵئاوساوەکە بە کتێبەکانی توێکاری .

گەیشتە گۆرِەپانی دەمی دوورگەکە . و لەبەردەمیدا شەقامی نیل و کوبری هەیە تا بگاتە ماڵەوە لە رەوزە . لەلای چەپێشی نیل هەیە ، لەلای ڕاستیشی ئەو شەقامە هەیە کە دەچیت بەرەو موقەتەم . ئەوەی بیبینیایە وا هەستی دەکرد کە ئێستا لادەکاتەوە بۆ شەقامەکە و دەرِواتەوە ماڵەوە ، بەڵام نەرِۆیشت و بە وەستاوی مایەوە ، ئەو دەیزانی گەر لابکاتەوە ئەوا زۆر سەیر دەبیت و شتێکی گەورە دەگەیەنیت لای ، شتێکی ترسناك .

ساتە وەختیکی مەترسیداری ترسناك ، لە مردن دەچیت ، بەڵکو جۆریکە لەمردن ، مرۆڤیکی تیادا لەدایك دەبیت و یەکێکی تیادا دەمریت ، ساتیکی کەم کە تیایدا جەستەی لادەکاتەوە بەلای ڕاستدا ، ئەوەندەی بەرزکردنەوەی پێی پیدەچیت بۆ

چوون بەرەو ئەو لایە ، یان هیندەی لیکنانی پیلوی چاوەکان ، لەگەڵ ئەوەشدا ساتەوەختی هەموو ژیان بوو لای ، وەك ئەو ژیانەی پێشتر ژیاوە و ئەوەی داهاتووشی ، هەموو ژیانی لەسەر ئەوە بەندە کە پی هەڵگریت و داینیت و لەناوی بەریت .

شەقامی لای ڕاستی لە شەقامی نەدەکرد ، شەقامەکانیش بەپێی گۆڕانی هەستمان بۆی گۆڕانی بەسەردا دیت چرکە بە چرکە ، و گۆڕانی خوێن لە دەمارەکانماندا ، و هەوای سنگمان لەهەر هەناسەیەکی نویدا ، و ئاوی دەریا لەگەڵ هەر شەپۆلیکدا . شەقامەکە زۆر فراوان و بەرز دیاربوو لە چیاکەوە هاتبوە دەرەوە و درێژ بووبوەوە ، و لە نیوانیاندا قۆڵەکەی تری دیاربوو لە نیوان چیاکە و ماڵەکاندا . دوو قۆڵی پتەوی وەك قۆڵی خوداوەندە ئەفسوناویەکە ، فراوان و کراوە وەك دوودەمی قەدەر درێژکراوە لە ئاسۆوە ، بە درێژایی ئاسۆ ، و بە پانتایی ئاسۆ ، بەرز و کراوە چاوەڕوانی ئەوەن لابکاتەوە و بەرەو لایان بڕوات .

بەڕاستی دەیویست لابکاتەوە ، و خۆی بهاویژیتە نیوان دوو قۆڵە درێژکراوەکان ، بەڵام جەستەی بەرهەڵستی ئەو لاکردنەوەیەی کرد ، و نەیتوانی قاچەکانی لە زەوی بەرزبکاتەوە . بە وەستاوی مایەوە ، و جانتا چەرمەکەی لی کەوتە خوارەوە و کتێبەکانی تایبەت بە توێکاری بڵاوبوونەوە لەسەر زەویەکە .

بەتیلەیەکی چاوی پانتاییە سپیەکەی سەر بەرگە ئەستورەکەی بینی ( بهیە شاهین ) یەکەمی توێکاری ، و قۆڵەکانی لە هەوادا مانەوە و نەیانویست کتێبەکان هەڵگرنەوە ، بەڵام جەستەی نوشتایەوە و کتێبەکانی لەسەر شۆستەکە کۆکردەوە و خستیەوە جانتاکە . ئەو نوشتانەوەیە بەس بوو بۆ ئەوەی بهیە شاهینی بۆ بگیڕیتەوە بە تواناوە ، و کەسەکەی تر بخاتە ژیرخانە قوڵ و تاریکەکەی ناخی و بە هەنگاوی خێرا بەرەو ماڵەوە بڕوات .

جوڵەی جەستەی بەرەو ماڵەوە جوڵەیەکی ئازایانەی سەرکەوتوو بوو ، بەڵام هەستە ڕاستەقینەکەی شتێکی تربوو . هەستی بە دۆڕاندن دەکرد و کاتێک کە لە دوورەوە ماڵەوەی بینی دڵی هەژا ، وەك بەندکراویکی هەتایی بەرەو زیندان ڕاپێچ دەکریت ، ڕاپێچ دەکریت بە هیزیکی وەك ئاسن ، لە دەستەکانی و

قاچەكـــانی ئـــاڵاوە ، تەواو وەك زنجیـــر هەســـتی پیـــدەكرد لە گەردن و دەســـتو قاچەكانیدا ، و بەبی بەزەیی و ڕەحم ڕایدەكێشێت بەرەو ماڵە سورە بچكۆلانەكەی
.
و لەو ساتەوە نەماڵەكە مالّی ئەوە و نە ژوورەكەشـی ، تەنانەت جیگاكەشـی هـی ئەو نەمـاوە . شـتەكان دەگۆڕِین وەك مـرۆڤ ، نەك هەر گۆڕِانیك لە شـیوەدا بەڵكو لە واتاشدا . ئیمە هەرگیز ڕاستی شتەكان نـازانین ، ئەوەندەشـی لـی دەبینـین كە ئیشـــمان پێیەتـــی . و تەنهـــا مێشـــكمانە شـــیوەی كەون دیـــاری دەكـــات لە دەوروبەرمان ، و قەبارەی ، و جوڵەیی ، و واتاشی .
مـــاڵەكەی وەك جیگـــایەكی پـــاریزراوی هـــێمن دەناســـی ، دوری دەخســـتەوە لە قەرەباڵخی شەمەندەفەر ، و كۆلیج ، و گەرمـایی و تینـی خـۆر و سـەرمای زستان ، و بـاوكی تیـادا دەبینـی كە ڕۆژانەكەی دەدایە و دایكـی كە خـواردنی بـۆ ئامـادە دەكـــرد ، و خوشـــكو براكـــانی كە دەموچـــاوی خـــۆیی لە زۆربەیانـــدا دەبینـــی و لیكچوویی هەبوو لەگەڵیانـدا ، و هەمـوو شـتەكانی دەوروبەری هێمنـی و ئارامیـان پیدەبەخشی .
بەڵام ئەمڕِۆ مـاڵەوە وەك بەنـدیخانەی لیهـاتووە ، و بـاوكی وەك سەرپەرشـتیاری بەندیەكانە ، لە هۆڵەكە لەسەر كورسیەكەی دانیشـتووە و سـەرنجی جوڵەی دەدات ، و دەیەوێـت لەپشـتیەوە شـتە شـاراوەكانی بـدۆزیتەوە ، و شـوین پەنجەكـانی دایكیشـــی هیشـــتا بە كاغەزەكـــانیەوەیەتی لە چـــاوی میزەكەیـــدا ، و لەژیـــر سەرینەكەشیەوە بەدوای نامەیەكی سۆزداری ، وینەی كوڕِیكدا دەگەڕِیت ، و چاوەكـانی خوشـك و براكـانی لە هەمـوو لایەكەوە چواردەوریانـداوە و لیشـاویك پرسـیاریان لێـی هەیە . لە هەمـوو ئەمـانە سـەیرتر ئەو سـەردانانەیە كە خەریـكە دەبیتە ڕۆژانە ، ئەویـش سـەردانی مـامی و ژنەكەیـی و كـوڕِە مـامەكەیەتی كە دەرچووی بازرگانیە و ( هەر لە منداڵیەوە قسەی ئەوە كراوە كە شووی پـی بكـات ) و ئەو خەندە بی بنەمایەی سەرلیوەكانی ، و ئەو شادیە كوشندە بی واتایە .
بۆی ئاشـكرا بـوو كە ئەو سـەر بەو خیـزانە نیە ، و ئەو خـوێنەی بە دەمارەكانیـدا دەرِِوات لە خـوێنی ئەوان نـیە . و گەر بە خـوێن بەسـتراوەتەوە بەو خیـزانەوە ئەوا ئەو بە گومـانە لەو بەسـتنەوەیە . گومـانی هەیە لەو خـوێنەی بە دەمارەكـانی

ئەوان و ئەمدا دەرِوات . دایكی ئەوی نەبووە . لەوانەیە دۆزیبێتیانەوە لە نزیك دیواری مزگەوتیك لەوانەیە باوكیشی هاوبەشی بوبیت لەو كارەدا ، ئیتر ئەمە واتای ئەوە نیە كە سەربەوانە و بۆ ئەوان دەگەرِیتەوە . ئەو شتەی كە پێی دەوتریت خوێنیان یەكە بە بۆچونی ئەو هیچ مانایەكی نیە . لەبەر ئەوەی شتێكە لە دەسەلاتی كەسدا نیە ، و بی ئازادییە . بەڵكو تەنها ریكەوتیكە و بی ویستی ئەم و بی ویستی دایك و باوكیشی كردویتیە كچی ئەوان .
نەیزانی چۆن گەیشتۆتە ئەم ئاستەی بیركردنەوە . بەلام ئەو ئەیویست بگاتە ڕاستی ئەوەی كە تەنها ویستی مرۆڤ وا دەكات پیكەوە گریدان واتای هەبیت . و دەیویست لەم ڕاستیەوە بگاتە ڕاستیەكی تر ، ئەویش ویستنی ئەو پیكەوە گریدانە بیت لە نیوان ئە و سەلیمدا ، پیكەوە گریدانیك بە شێوازیك لە شێوازەكان ، لە هەر شێوازیك بیت ، وایلیبكات هەر كە بینی لە نیوان هەزاراندا بوەستیت و بەرەو لای برِوات ، و ئەویش بی گویدانە ئەو هەزارانە بوەستیت و بەرەو لای بچیت ، تەنها ئەم جولە و كردارەیە كە واتایەك ئەبەخشی بۆ پیكەوە ژیان ، بەڵكو مانایەك دەداتە ژیانی . ئەو بەتەواوی نەیدەزانی لە ژیانیدا چی دەویت . هەموو ئەوەندەی كە دەیزانیت نایەویت بهیە شاهین بیت ، و هەروەك نایەویت كچی دایك و باوكی بیت ، و نایەویت بگەرِیتەوە بۆ ماڵەوە ، و نایەویت بچیت بۆ كۆلیج ، و نایەویت ببیتە پزیشك ، و نایەویت پارەیەكی زۆری هەبیت ، و هەوەها نایەویت میردیكی بەرِیزی هەبیت ، و منداڵی ناویت ، و خانووی ناویت ، كۆشكی ناویت ، هیچ شتێكی لەمانە ناویت . ئەو چی دەویست ؟
مێشكی بهیە شاهین مێشكی خۆی نەبوو . ئەو عەقڵیكی تایبەتی خۆیی هەبوو . هەستی پیدەكرد لەژیر تویژاڵكی مۆخی كەللەسەری پرِكردبوو گەورە هیندەی قەبارەی جەستەی ، بە ڕێگایەكی شەیتانیانەی شاراوە پێی دەوت كە ئەو شتانە هیچی هیچ نین ، و ئەو شتێكی تری دەویت ، شتێكی تەواو جیاواز ، نادیار و ئاشكرا لە هەمان كاتدا ، دەستنیشانكراو و بە پیچەوانەشەوە ، بتوانیت بە سەری فلچەكە وینەی بكات لەسەر رووی كاغەزە سپیەكە وەك هیڵیكی ڕەش ، بەلام كاتێك بە چاوە ڕەشەكانی لێی ورد دەبیتەوە لەپێش چاویدا دەبیتە هیڵیكی

درێژكراوە لە ئاسۆوە ، بە درێژایی و پانتایی ئاسۆ و سەرەتاو كۆتایی نەدەزانرا .

وەك ونبوویەك لەم شەقام بۆ ئەو شەقام دەگەڕا ، وەك زەر ِر ِەیەك لە هەوای ونبوو كە مەلە دەكات لە نیوان ملیۆنان زەر ِر ِاتدا ، و خۆی تەواو شل كردبوو هەوا بۆ هەر جییەكی ئاراستە بكات ، لە دەرەوەی وەك خۆبەدەستەوە دراویك وابوو كە بەرەو نەمان دەچوو ، وەك كەسێک پێی خۆش بیت ئەو توانەوە و فەنا بوونە لە كەوندا ، بەڵام لە ناوەوە لە بەرهەڵستی كردندا بوو ، ماسولكەكانی توند دەكردەوە و بەرهەڵستی ئەو جوڵە خۆنەویستانەیەی دەكرد ، خۆبەدەستەوانی بۆی رەتدەكردەوە ، و بە هەموو توانای قاچەكانی لە جوڵەكردن قەدەغە دەكرد ، بە هەموو توانای دەیویست بوەستیت .

وەك ئەسپیك بینی بە جەستەیەوە ریك وەستاوە درێژ و باریك ، و چاوە ڕەشەكانی كردۆتە ئاسمان ، و قژە ڕەشەكەشی پەخشان بووە بەسەر شان و مل و گویچكەكانیدا لە دواوە ، و لوتی ریك و ، لیوەكانی لە توڕەییدا توند جووت بوو بوون .

ئاوڕیكی بە چواردەوری خۆیدا دایەوە تا بزانیت لەكوییە . بەڵام ئەو لە جیگایەك خۆی بینیەوە كە پێشتر نەهاتبوو . خانوەكانیشی نەبینیبوو و خەڵكەكەش لە دەوروبەری دەهاتن و دەچوون لە جوڵەیەكی بەردەوامدا ، هیچ كەسێک نایناسیت و ئەویش كەس ناناسیت . خوێن هوروژمی هێنا بۆ دەم و چاوی و هەناسە بر ِكیی پی كەوت وەك چۆن كەسێک لە دەریادا ون دەبیت ، وەك ئەوەی ژیان لە دەوروبەری بوبیتە شلەیەك ، ژیری و سەری ئاوە ، و نە دەستەكانی و نە قاچەكانی ناتوانن خۆیان بە شتێكی ر ِەقەوە بگرن .

بە لەرزینیكەوە پەنجەكانی جوڵاند وەك چۆن كەسێک لە ئاودا بە ترس و لەرزەوە دەست دەگیر ِیت بۆ بەلەمی رزگاربوون ، و كاتێكیش پەنجەی بەر شتێكی ر ِەق كەوت لە گیرفانیدا هەر پینج پەنجەكەی ئاڵانە كلیلە كانزاییەكە و گوشییان ، وەك ئەوەی بیەویت دڵنیا بیت لە بوونی ، یان وەك ئەوەی لە ر ِەقییەوە هەستیكی وا وەرگریت كە ژیان مانای هەیە ، و شتێک هەیە ئەتوانریت بە پەنجەكان بگیریت .

بە هەمان خێرایی و بە هەمان تواناوە ، جەستە نوقم بوەکەی کەوتە جوڵە کاتێک شتێکی رِەقی گرتووە ، و قاچەکانی بەخێرایی بە تەقە تەق بەسەر چیمەنتۆکەدا هەنگاوی دەنا ، و چاوەکانی دەگەڕا لە نیوان ئەو خانوانەی لە چیاکەوە هاتوون و بەناو کۆڵانە تیکەڵەکاندا ، و بە ئاسمانی تەنراو بە خانوو و شینی نیوان چیاکە .

ئەو رایدەکرد ، بەڕاستی رایکردبوو . و بە جوڵەیەکی خێرای چاوەکانی سەیریکی مەچەکی کرد . کاتژمیر چوار و نیو بوو . دڵی هەڵبەز و دابەزیکی کرد ، و سنگی بەرز دەبوەوە و نزم و قاچەکانی خێرا وەك ئەوەی لە پێشبرِکیدا بیت لەگەڵ هەناسەکانی .

دەرگایەکی بچوکی لەبەردەمدا کرایەوە کە لقیك داری سەوزی بەسەردا شۆرِ بووبوەوە ، و دەم و چاویکی درێژی باریکی لاوازی بینی ، وەك ئەوەی کە هەرگیز نەنوستبیت ، و نان نەخوات ، و مێشکی جەنجاڵ بوبیت بە کیشە و گرفتەکانی مرۆڤ و جیهانەوە ، و چاوە شینە قوڵەکانی بەلای ڕەشیدا یان ڕەشەکانی بەلای شینیدا هیندە بە قوڵی سەرنج دەدەن تا دەگەنە دورترین قولاییەکانی ناخ .

- بەخیرببیت بهیە .

بیستنی دەنگی بەلایەوە دەنگدانەوەیەکی سەیری هەبوو لە گوێیدا ، و ناوی بهیە تایبەتمەندییەکی سەیری دروستکردووە ، نەك وەك ناوی بهیە یان هەر بهیەیەك ، بەڵکو بیگومان ئەو ، جگە لە ملیۆنان ، بە کیانی تایبەتیەوە ئەوەی کە لە هۆڵە غەریبەکەدا وەستاوە بە پیوە .

هۆڵی دانیشتنەکە نیمچە روتیك بوو چونکە ناومالیکی کەمی تیدابوو ، تەنها قەنەفەیەکی گەورە نەبیت لە سوچیکدا و مێزێک کە گوڵدانیکی لەسەربوو لەودیویەوە پەنجەرەیەکی گەورە دیاربوو دیمەنی چیا زەبەلاحەکەی لیوە بەدیدەکرا . لەسەر قەنەفەکە دانیشت ، ئەو پشتی تیکرد تا لە دوایەوە دەرگاکە دابخاتەوە ، دەموچاو و روخساری لی ون بوو کاتێک پشتی تیکرد ، وەك پیاویکی بیگانە هاتە پێش چاوی کەنایناسیت ، و کاتێکیش گوێی لە دەنگی داخستنی دەرگاکە بوو بیری کەوتەوە کە ئەو بهیە شاهینە ، خوێندکاری سەرکەوتووی پزیشکی ، و ناو و ناوبانگ پاك ، و بەڵام ئەو ئێستا بە تەنها لە

خانووی پیاویکی بیگانەدایە ، پشتی وەك پشتی پیاوانی ترە ، و هیچ شتێک پیوەی گری نادات . سەرسورِمانیکی وەك ئەو سەرسورِمانەی لە خەونەکاندا هەیە دایگرت ، کاتێک کە مرۆڤ خۆی لەو شوینانە دەبینیتەوە کە پێی نامۆیە و پێشتر نەیبینیون ، و کەسانیکی بیگانە ببینیت کە پێشتر نەیبینیون .
و مێشکی بە خێرایی وەك لە خەونەکاندا کەوتە کارکردن ، و زۆر شتی هاتە پێش چاو ، باوکی هاتە پێش چاو لەسەر کورسیەکەی لە هۆڵەکەدا دانیشتووە قاوەی بەیانی دەخواتەوە ، رِۆژنامەکە دەکاتەوە دیمەنی لاشەی بهیەی کچی بە رووتی و بە کوژراوی دەبینیت لە شوققەی کورِیکی سەڵتدا لە ( موقەتەم ) .
باوکی برِوای وایە کە بهیە تەنها رِێگەی ماڵەوە بۆ کۆلیج دەزانیت ، و نویژ دەکات و بەرِۆژوو دەبیت ، لە رِۆژێکدا چوار کاتژمیر سەرقاڵی وانەکانیتی ، و کاتێک گوێبیستی گۆرانیە سۆزدارییەکان دەبیت لە رادیۆدا دەیکوژینیتەوە ، و کاتێکیش یەکێک لە گەنجەکانی خیزان لەگەڵی پیدەکەنیت لای کردەیەکی قیزەونە ، و ئەو جیاوازە لەهەر کچیکی تر ، بەڵکو ئەو جەستەی نیە ، هیچ کۆئەندامیکی نیە ، بەتایبەتی ئەو کۆئەندامانەی کە بیجوڵێنیت یا ببیتە هۆی وروژاندنی لەلایەن رەگەزی بەرامبەرەوە .
خەیاڵی بیزار بوولەو خورپەیەی پێی گەیشت ، کاتێک باوکی دیمەنی جەستەی کچە گویرِایەڵەکەی بە رووتی ببینیت ، نەك لە ژووری تایبەتی نوستنی بۆ نمونە ، بەڵکو لە شوققەی کورِیکی سەڵتدا و نەك تەنها چاوی ئەو بەڵکو چاوەکانی بەهەزاران دەیبینیت لەکاتی خوێندنەوەی رِۆژنامەکان ، چاوەکانی خیزانە گەورەکەی بە درێژایی وڵات لە ( ئەسوان تا ئەسکەندەرییە ) ، و بە تایبەت چاوەکانی جوتیاران و سەعیدیەکان لێیان ، و چاوەکانی سەرجەم فەرمانبەرانی وەزارەتی تەندروستی ، سەرو خوارو خۆی کە بە درێژایی سی ساڵ وای تیگەیاندوون کە بەرِیوەبەریکی رەسەن و خاوەن خیزان و ئەسڵ و فەسڵ و ناوبانگ شەریف و بیگەردە ، و کورِوکچەکانی هەموو نەجیب و گویرِایەڵ و ناو و ناوبانگ خاوینن بە تایبەتی بهیە خوێندکاری سەرکەوتووی پزیشکی .

وەك چۆن لە خەونەکانـدا راچڵەکـی ، و لەو بـرِوایەدا بـوو کە تەمەنـی هەمـوو دەدات لە پێناو ئەوەی بـاوکی لەو خورپەیە بپارێزێت ، و باشترە کە جەستەی بە رووتـی پارچەپارچە بێت بە مەرجێك بـاوکی نەزانێت ، بەدەر لە هەموو شتێک بــاوکی خۆشدەویســت ، و کاتێــک کە بەیانیــان دەســتی بــۆ درێــژ دەکــات و وەرەقەیەکـی پێکهـاتوو لە دە قرشـی دەداتـی دڵـی دەچێـت بە ناخـدا وەك بەرد ، و کاتێکیش پەنجەکـانی بەر وەرەقەکە دەکەوێت و بۆنی ئەو عەرەقە دەکـات کە لێـی دێـت خوازیـارە دەموچـاوی بشـارێتەوە و بگـری . دەیزانــی کە هـیلاك دەبێـت و هەوڵـی بەردەوامە لە پێناو ئەو و خوشك و براکانی ، هەنـدێک جـار دەیبینـی چۆن بەو جەستە بارێکە لاوازە پشت چەماوەیەی قەرەباڵخیەکان دەبرِێت و دەرِوات ، کاتێــک قەرەبــاڵخی دەبــرِێـت و دەچێـتە ســەر شــەقامەکە دڵــی لایەتــی نەك ئوتومبیلێك لێی بدات . جارێکیان بینی لەسەر لێواری پلیکانەکـانی شـەمەندەفەرەکە وەسـتابوو لە بــی جێگاییـدا ، و هــات بە خەیاڵیـدا کە بەهـۆی قورســی پێکــانەوە پلیکــانەکە دەپسـێت و بــاوکی دەکەوێـتە خــوارەوە و دەچێـتە ژێـر تایەکــانەوە . جارێکی تریان دەچێت بۆ نوسینگەکەی بـاوکی لە وەزارەت ، لە تـارمەکەدا بینـی لە دوای بەرپرسـی گەورەتر لەخۆی دەرِوات ، کە پشتی زیـاتر چەمـابوەوە ، و ماسولکەکانی ملی زیـاتر شۆرِ و خـاوبوون ، و سـەری زیـاتر چوو بوە پێشـەوە وەك ملکەچــیەك ، و بەرپرســـەکەش لە پێشــیەوە بە فیــزیکەوە بە رِێکــی و ماسولکەکانی توند کردبوەوە و سـەری بە پشتدا کەوتبوو دەرۆیشت ، لەو کـاتەدا خوازیـاربوو کە زەوی بقڵیشـێت و بچێـتە نـاوی ، کاتێـک بـاوکی لە تەنیشـتیەوە لە شـەمەندەفەرەکەدا دانیشـت و خەنـدەیەکی بـۆکرد ئەم پێنەکەنــی ، خـۆی پاراسـت لەســـەیرکردنی دەموچـــاوی تـــا رِۆژی دواتـــر ، و کاتێـــک پـــارە کـــاغەزیە عەرەقـاویەکەی بـۆ درێـژ کـرد خەریـك بـوو رەتـی بکـاتەوە ، بەڵام وەرگـرت و هەسـتی بە ئیهـانە کــردن کــرد ، زۆر بە قورســی ســەری بەرز کــردەوە و لە چاوەکــانی ورد بــوەوە ، بینــی رِەشــاییەکانی لەژێــر فرمێســکیکی نەبینــراوەوە ئەبریسکینەوە .

* * *

وروژا ویستی هەستیت ، پێش ئەوەی بە تەواوی هەستیت لایکردبووەوە ، و دەموچاوی بەرامبەری بوو ، چاوەکانی بڕِیبووە چاوەکانی و تەیاریکی سحری بە کییانیدا هاتە خوارەوە هەستیکی وای دەداتی کە هەموو شتێک بەدەر لەو شوینە و لەو زەمەنەی ئێستا تیایدایە بی مانایە و بونیکی ڕاستەقینەی نیە ، و سەرجەم ژیانی لە پێش و دوایەوە ژیانی ئەو نیە و هی کەسێکی ترە ، و هیچ شتێک نایبەستیتەوە بەو جیهانەی تیایدا ژیاوە ، یان بەو خەڵکانەی ناسیونی ، هیچ شتێک بە هیچەوە نایبەستیتەوە تەنها ئەو دوو چاوە ڕەشە نەبیت کە ئێستا لە بەرامبەریدا وەستاوە و بوونی ڕاستەقینەیان دەسەلمینن .

- سلیم .

دەنگی دەنگدانەوەیەکی سەیری هەبوو لە هۆڵەکەدا ، وەك دەنگی کەسێکی تر ، لای سەیر بوو ، ناو ( سلیم ) یش لە گوێیدا سەیر بوو وەك ناوی کەسێکی تر . لە نیوان خودی خۆیدا چەند جارێک دووبارەی کردبوەوە تاکو دەنگەکە بە گوێی ئاشنا بیت و شێوازیکی ئاسایی وەرگریت ، بەڵام لەهەر جارێکدا ناوەکە زیاتر لە جاری پێشوو نامۆ دەبیت لای . ناوی سلیمە و ئەویش ناوی بهیەیە ، ناوی لە ناوەکەی ئەو سەیر تر نیە لە گوێیدا . بەڵام ناوەکان چەند دوورن لە ڕاستی شتەکانەوە ، و بۆچوونی مرۆڤ چەند بیتوانایە لە تێگەیشتی ئەوەی مرۆڤ هەستی پیدەکات !. ئەوەی کە هەستی پیدەکات لە بەرامبەریدا زیاترە لەوەی کە گوێی ئەیبیستی ، و چاوەکانی لە بینین ، و لوتی لە بۆنکردن ، و پەنجەکانی لە هەستکردن بە بەرکەوتنی شتەکان . و ئەو ساتە بۆی دەرکەوت کە مرۆڤ هەستی تری هەن بەڵام شاراوە ، هیشتا نەدۆزراونەتەوە ، و سرِن ، و لە ناخی نەفسدا حەشاردراون ، بەڵام زۆرترە لەو هەستە دیارانەی ئاشکران ، چونکە بریتین لە هەستە ڕاستەقینە سروشتیەکان ، پەروەردەی ناوماڵەکان تیکی نەداون ، و خوێندنی قوتابخانەکان نەیشیواندوون ، و یاساو ریسا و نەریت و هیچ شتێک خۆی لە قەرە نەداون . وەك روباریکی بەخورِی بی بەربەست وەك بارانیکی بەخورِی هاتوو لە ئاسمانەکانەوە بی بەربەست بۆ هەرکوییی بویت سەربەستانە دەرِوات .

ئەو ئەوكاتە لەسەر قەنەفەكە دانیشتبوو ، و ئەویش لەتەنیشتیەوە ، و لەبەردەمیدا پەنجەرە گەورەكە كە چیاكەی لیوە دیارە ، لەپشت چیاكەوە ئاسمانیكی شینی سورهەڵگەڕاو داخ بوو بە تیشكی خۆر دەبینرا . تیشكی خۆرەكە پیچەوانە بوو بوەوە لە چاوەكانیداو پرشنگیكی وەك خەندەی دروستكردبوو پیكەنی بە دەنگێكی بەرز و بە دەستی ئاماژەی بۆ ئەو دیمەنە كردوو وتی :

- لیرەوە ئەو دیمەنە زۆر جوان دیارە .

وا هەستیكرد كە ئەویش لەگەڵ ئاماژەی ئەمدا سەیری پەنجەرەكە دەكات ، بەڵام بە پیچەوانەوە ، و بەردەوام چاوی لەسەر چاوی بوو ، تیكەڵی كردوو وتی :

- بۆچی سەیر ناكەیت ؟ دیمەنیكی جوان نیە ؟

لە جیی خۆی وەڵامی دایەوەو وتی :

- تۆ لەو دیمەنە جوانتری .

چاوەكانی لە چاوانی دوورخستەوە ، پێی سەیربوو وتی :

- بۆ چاوەكانت دوورخستەوە ؟

تیكەڵی كردوو وتی :

- نازانم . بەڵام چاوەكانت هەندێك جار دەڵیی چاوانی تۆ نین .

لێی پرسی : چاوانی كین ؟

وتی : چاوی پیاویكی تر .

لێی پرسی : ئەی كامیانت پی باشترە : من یاخود پیاوەكەی تر ؟

وتی : تۆ .

هەردووكیان پێكەنین . وتی :

- هیچ ناخۆیتەوە ؟

وتی :

- نەخێر .

وتی :

- ئەی هیچ ناخۆیت ؟

وتی :

- نەخێر .

جارێکی تر بەبی هۆ پیکەنیەوە ، کاتێکیش گوێی لە پێکەنینی خۆی بوو لە نیوان خودی خۆیدا ئەو پرسیارەی کرد کە ئایا ئەمەیە شادمانی ، وە ئایا شادمانی بریتیە لەوەی کە جیهان بە سەرجەم شتەکانەوە ون ببیت و تەنها پانتاییەکی کەم نەبیت بمینیتەوە کە ئەو دوانەی لەخۆ گرتووە بەرامبەر یەکتر بێئەوەی بەر یەکتری بکەون ؟

ویستی ئەو ساتەی شادمانی بگریت ، تاوەکو تام و چیژی ڕاستەقینەی بزانیت ، بەڵام ئەو ناسك و بی پەردە بوو وەك هەوا ، هەر دەستی بەرز بکاتەوە شیواوە . دەستی لە نزیکی دەستی دانابوو لەسەر قەنەفەکە ، و تەنها مویەك لە هەوا نیوانیان بوو ، بەڵام هیچکامیان دەستیان نەجوڵاند ، و هەردووکیان لەوە دەترسان گەر دەستیان بجوڵینن ئەو نیوەندە هەوایەی نیوانیان بشیویت و لەگەڵیدا ئەو ساتە لە شادمانی نەمینیت و لەناو بچیت .

هەردووکیشیان بەو ساتە بیتاقەت بووبوون و خوازیار بوون زوو بگەنە کۆتاییەکەی ، لەبەرئەوەی شادمانی هەستیکە مرۆڤ لە تەنها ساتیك زیاتر توانای بەرگە گرتنی ناکات ، و دەبیتە زەرِرِەیەك هەوا لە کەوندا ، نە زەوی ڕایدەکێشێت و نە ئاسمان بۆ خۆیی بەکیش دەکات ، بە هەڵواسراوی ، و چەند ئاستەنگە مرۆڤ بە هەڵواسراوی لە نیوان زەوی و ئاسماندا بمینیتەوە ، و حەزی چەندە زۆرە بۆ ئەوەی پێی بخاتە سەر رەقاییەك یان هەرشتێک کە بوونی بسەلمینیت بە هەموو قورساییەکانیەوە.

وەك هیزی ڕاکێشانی زەوی کاتێک جەستەیەك بۆخۆی ڕادەکێشێت و هیچ شتێک تەنانەت هەواش لە نیوانیاندا نامینیت ، چونە ئامێزی یەکتری و قۆڵیان لە یەکتر ئاڵاند ، و بەو حەزە زۆرەوە بۆ توانەوە لە کەوندا ، و هەستکردن بە نەمانی قورسایی جەستە و ونبوون و فەنابوونی لە هەوادا وەك زەرِرِە ، وەك مردن گەر یەکێک بمریت و بتوانیت زیندوو بیتەوە و مردنمان بۆ بگیرِیتەوە ، بەڵام بیگومان وەك مردن نیە ، چونکە مردن مردنە و مرۆڤ تیایدا هەستەکانی لە دەست دەدات ، بەڵام کە مرۆڤ هەستەکانی لەدەست بدات و بە پیچەوانەوە واتە لەدەستی نەدابیت ، و جەستەی فەنا بووبیت و کەچی هەر مابیت ، و جیهان لە چواردەوری نەمابیت و ئەو زیندوو بیت ، و زەوی وەك ئاسمانی لیبیت و

ئاسمان وەك زەوی ، و هەموو شتەکان تیکەڵ ببن و بچن بە یەکدا لە خاڵێکدا ، لە نیوەندی سەردا ، و وەك ترپەی دڵ و پتەوتر لیبدات .
بە گویچکەکانی خۆی گوێی لە لیدانەکانی دڵی بوو ، و کاتێکیش کە دەنگ دەچیتە گویچکەکانی وەك لیدانەکانی دڵی لیدیت ، و هەموو شتێک تیایدا کاتیک بەر هەستەکانی دەکەویت وەك ئەوە وایە بەر جەستەی کەوتبیت ، و زۆر بە زەحمەت ئەتوانیت جەستەی لە جەستەی ئەو جیا بکاتەوە ، هەمان گەرمی ، و هەمان بۆن و بەرام ، و ڕەنگی پێست ، و جوڵە و سورِی خوێن لە دەمارەکاندا ، و هەموو شتێک تیایاندا وەك یەکە وەك ئەوەی یەك جەستە بیت . ویستی وشەیەك بچرپینیت بە گوێیدا ، بەڵام هیچ وشەیەکی نەدۆزییەوە . ئایا بۆ نمونە پی بڵیت ( خۆشمئەوییت ) ، بەڵام ئەو وشیە پێش ئەوەی لە لیوەکانی بیتە دەرەوە ناکامە ، ناتوانیت ڕاستیەکان دەرببرِیت . ئیتر واتای وشەی ( خۆشم ئەوییت چیە ) ؟
بێدەنگی ئەتوانیت تەعبیر لە ڕاستی هەستەکانی بکات ، لەبەرئەوەی ئەو بەو بێدەنگیە شتێکی ترسناك ئەڵیت ، ئەڵیت کە وشە بەکارهینراوەکانی نیوان مرۆڤەکان چیتر کەڵکیان نەماوە ، و ئەو پێویستی بە وشەی ترە ، وشەیەك کە دروستکراوی خودی خۆی بن، و زمانیکی نوی کە وشە کۆنە بەکارهاتوەکان نەتوانن تەعبیری بکەن . ئەویش هەروەها بێدەنگ بوو ، نوقم بووبوو وەك ئەوەی بگەرِیت بە شوین نهێنی ساتەوەختی بە یەکگەیشتی ئەبەدی ، کاتێک کە جەستە هەست بە جیا بونەوە دەکات لە کەون ، و ئیدی ئەو و کەون دەبنە یەك ، و کیانیکی زەبەلاح کە پرِی پانتایی نیوان زەوی و ئاسمان بیت .
کاتێک چاوەکانی هەڵبرِی لە پەنجەرە شوشەکەوە چیاکەی بەدیکرد بە هیواشی هەستی گەرِایەوە بۆ سەر قەنەفەکە ، و بە دەستلیدانی جەستەی متمانەی بۆ گەرِایەوە ، و زانی کە جەستەیەکی جیاواز لە جەستەی ئەوی هەیە ، و چاوەکانی لە سەرسورِمانیدا گەش بوون ، بەڵام لەبەردەم خۆیدا بینی و پیکەنی پێی وت :

- سەیر نیە ؟

وتی : چی سەیرە ؟

وتی : ئەوەی کە لە نیوانماندا روو دەدات .
وتی : چی لە نیوانماندا روو دەدات ؟
وتی : شتێکی سەیر .
وتی : بۆچی سەیر ؟
وتی : بەم خێراییە ؟ و بی هیچ وشەیەك ؟
وتی : ژیانی ڕاستەقینە زەمەنی تیدا نیە ، بەڵام وشەکان ئەوا خەڵکی لە پیناو بیانوو هێنانەوە بۆ ژیانی نا ڕاستەقینەیان دروستیان کردوون .
هەردووکیان پێکەنین .
وتی : بەڵام ئەی چۆن لە خەڵك تیبگەین ؟
وتی : تێگەیشتن لە خەڵکی شتێکی قورسە بهیە . خەڵکی مرۆڤی ڕاستەقینەیان ناویت . لەسەر ساختەکاری راهاتوون تەنانەت ساختەکردنی خودی خۆشیان و بە تیپەڕبوونی کاتیش خودی ڕاستەقینەی خۆیانیان بیرچۆتەوە . کاتێکیش کە مرۆڤیکی ڕاستەقینە بەدی دەکەن پێی تیکدەچن و لێی ئەترسین تا ئەوەی کە لە ترسان لەناوی ببەن و بیکوژن . لەبەرئەوە پێویستە کە ئەو مرۆڤە بەردەوام لەژیر چاودیری وردا بیت ، یان مەحکوم بکریت یا بکوژریت ، یا زیندانی بکریت ، یاخود دابڕدریت لە خەڵکی و ببریتە شوینیکی تەریك .
وتی : لە شوققەیەك لە چیای موقەتەم .
وتی : بەڵی لە شوققەیەك لە چیای موقەتەم .
وتی : سلیم من تۆم خۆشئەویت .
چاوە ڕەشەکانی کە بەلای شیندا دەڕوانیت بڕیبووە چیاکە و ئاسمان ، و تا ماوەیەك بەبی دەنگی مایەوە وەك ئەوەی لە شتێکی دووردا نوقم بووبیت . ویستی لێی بپرسیت کە سلیم ئایا منت خۆشئەویت ، و بە گویچکەکانی خۆی گوێی لە دەنگی بیت کاتیک پێی ئەڵیت خۆشمئەوییت بهیە ، بەڵام ئەم پرسیارەی بەبی واتا زانی . وەڵامدانەوەی چ سودیکی ئەبیت ؟ ئەم خۆشی ئەویت و گەر ئەو خۆشی بویت یان بە پیچەوانەوە هیچ شتێک لە خۆشەویستی ئەم بۆ ئەو کەم ناکات .
وتی : سلیم بیر لەچی ئەکەیتەوە ؟
وتی : لەوانەیە دوای نۆ مانگی تر منداڵیکمان ببیت .

راچڵەکی ، و دەستی لەسەر قەنەفەکە لەرییەوە و ، زانی کە لەسەر مەچەکی دوو میل هەن ئاماژە بۆ کاتژمێر حەوت و نیو ئەکەن ، و بە هەمان ئەو هەستە توندە شڵەژاوەوە ماڵەوە و کۆلیج و باوکی و توێکاری ، و کتێبەکانی توێکاری ، و هاورێکانی ، و دکتۆر علوی ، و شەمەندەفەرەکە ، و شەقامەکان ، و خەڵکی ، و تەواوی جیهانی بیرکەوتەوە کە وایزانی لێیان دابڕاوە و ناگەڕێتەوە بۆلایان .
بەسەرسوڕمانیکەوە پرسی : منداڵ ؟ هەرگیز ئەو شتەی بە خەیاڵدا نەهاتبوو ، نەیدەزانی کە منداڵان بەوجۆرە وا بەخێرایی دروست دەبن ، و لەو لەهۆش خۆچونەی جیهاندا ، و جیابونەوەی تەواو لە زەوی . ئەکریت ئەو جەستەیەی کە لە کەونیدا لە ساتوەختیکدا ون بوە و فەنا بووە بتوانیت جەستەیەکی دیاریکراو دروستبکات کە پەیوەست بیت بە زەویەوە ، و ساتەوەختیکی ون ساتیکی دیاریکراو دروستبکات کە جەستەی هەبیت و بە پەنجەلیدان بتوانیت لەبوونی دڵنیا بیتەوە ؟ .
هەستی بە ترپە و لیدانیکی تر کرد لە قوڵایی ناخیدا ، وەك ژیانیکی سحری لە هیچەوە دروستبوو ، وەك ئەوەی کەسێک سەرنجی بەردیکی گەورەی چیا بدات و لەپڕ ئەو بەردە لە جیگەی خۆی دەست بە لیدان بکات وەك ترپەکانی دڵ . و لیوەکانی لەسەرسوڕمانی خۆیدا کرانەوە و ، شادمانی دایگرت ، و دەستی خستەسەر دڵی و هاواریکرد :

- سلیم بڕوانە .. ئەجوڵیت .

بینی سەیری چیاکە دەکات و بەسەرسوڕمانیکەوە وتی :

- چی ئەجوڵیت ؟

بە پێکەنینیکەوە وتی : چیاکە .
ئەویش لەگەڵی پیکەنی . بەڵام پاش کەمێک بێدەنگ بوو ، و زانی کە ئەو خۆشیەی ڕاستەقینە نیە . و چیاکە ناجوڵیت ، و جیگیرە ، زەوی و دیوار و پەنجەرە شوشەکە و قەنەفە و هەموو شتەکان لەدەوروبەری جیگیرن ، تەنها ئەو دوو میلەی سەر مەچەکی نەبیت لە جوڵەیەکی بازنەیی ریکوپێکی هیواشدان ، ئەوەی بیردەهینیتەوە کە زەمەن تیدەپەڕیت و ناگەڕیتەوە ، و ساتەکانی ژیانی

لە هیچەوە دەکەون ، و لە هیچەوە دین ، و هیچ شتێک نامینیت تەنها جوڵە لەرینەوەکەی ئەو دوو میلە کانزاییەی ناو ئەو سنوقە کانزاییەی هیندەی پارەیەکی کانزایی دەبیت و بەسەر قەپاغیکی شوشە داپۆشراوە .
بەدەنگێکی غەمگینەوە وتی :
- سلیم .
وتی : بەڵی بهیە .
وتی : نامەویت بگەڕیمەوە بۆماڵەوە .
وتی : مەگەڕیرەوە .
وتی : بەڵام ....
وتی : بەڵام چی ؟
وتی : باوکم و دایکم و کۆلیج و خەڵکی و ....
وتی : بهیە شاهین و .
هەستی بە دڵۆپە عەرەق کرد لە لەپی دەستەکانی و بەرموسەڵدانی ، و پێستی ڕەنگی تیادا نەما وەك پێستی بهیە شاهین ، و چاوەکانی ڕەشیان کەم بووبوەوە ، و لوتی بەرزییەکەی کەم بووبوەوە ، هەوڵیدا سەری بەرزبکاتەوە و لوتیشی وەك جاران تیژ و بەرز کەون شەق دەکات بۆ دوو بەش و بە نیوانیاندا دەڕوات بی دوودڵی ، و بی ترس ، و ئەگاتە کۆتایی ، کۆتایی کۆتایی . بەڵام بهیە شاهین گەڕاوەتەوە بۆلای . چۆن گەڕاوەتەوە ؟ نەیدەزانی . و لەناکاو و بێئەوەی هەست بکات هەستایە سەرپی ، و جانتا چەرمە هەڵئاوساوەکەی هەڵگرت و بەرەو دەرگاکە چوو .
ئەو شەوە کاتێک چووە ناوجیگاوە وایزانی ئەوەی کە رویدا تەنها خەون بووە . وە گەر خەون نەبیت ئەوا روداویکی خۆنەویستانە بووە وەك هەر روداویکی تری قەزاوقەدەر ، و بە قودرەتی قادر گەڕاوەتەوە جیگاکەی خۆی ، و جەستەی خودی جەستەی خۆیەتی بە سنوری دەستنیشانکراو و بە هەموو بەشەکانیەوە .
بەڵام بە مێشکیکی تری شەیتانی زانی کە ئەو روداوە کتوپڕە تەنها شتێکی ڕاستەقینەیە لە ژیانیدا . و کتوپڕ نیە ، و خەون نیە ، و قەزاوقەدەر نیە ، و

ریکەوتیش نیە ، بەڵکو تەنها شتێکە کە بە ویستی خۆی ئەنجامی دابیت ، ئەو شتەی کە ویستبووی بیکات .
سەرجەمی ژیانی هەمووی ویستی خۆی نیە ، و بە ئارەزووی خۆی نیە . ئەو دایکی دروستی کردووە ، و باوکی خستویەتیە کۆلیجی پزیشکی ، پوری لەبەرئەوەی کە نەخۆشی سنگی هەیە دەیەوێت پسپۆڕی بەدەست بهینیت لە نەخۆشیەکانی سنگدا ، خاڵیشی دەیەوێت ببیتە پزیشکیکی سەرکەوتوو و پارەیەکی زۆری نەخۆشەکانی بەسەردا دابباریت تا بۆ کوڕەکەی خۆیی بهینیت کە دەرچووی بازرگانیە ، و هەروەها پارەی بازرگانیشیان دەستکەویت و دوو کوڕیان ببیت تا میراتیان بۆ بمینیتەوە و ناو و ناوبانگی خۆیان و باو و باپیریان هەڵگرن .
هەریەکەیان ئارەزوەکانی پی دەوت . بەڵام کەسێکیان پرسیاری ئەوەیان لی نەکرد کە ئەو چی دەویت ؟ ڕاستیەکەشی ئەوەیە کە ئەو هیچکام لەو شتانەی ناویت کە ئەوان دەیانەویت و داوای دەکەن . نەیدەویست ببیتە پزیشك و بەتایبەت پزیشکی نەخۆشیەکانی سنگ . ئەو ریزە دورودرێژەکانی نەخۆشەکانی سنگ و سیلی وەك ئێسکە پەیکەر دەبینی کە وەستابوون ، و پزیشکەکانی نەخۆشیەکانی سنگیش ورگ زل و جەستەیان پڕ . و مامیشی خۆشنەدەویست ، و کوڕەکەشی کە دەرچووی بازرگانی بوو ، ئەو کوڕە لە چاوی خیزانەکەوە کوڕیکی خوێنگەرمی جوان بوو ، درێژیکی باڵا ریك بوو ، سپی پێست ، و سەر رومەتەکانی پەمەیی ، و چاوەکانی لە تەندروستیدا دەبریسکانەوە ، و روخساری هیندە ساکاربوو لە روخساری منداڵیکی ساوای دەکرد کە هیشتا شیری دایکی دەخوات ، و بۆ هەمووان خەندەیەکی شادمانی دەکات .
ئەو قینی لە خەندە و شادمانیەکەشی بوو ، و بەردەوام بە دەموچاویکی گرژ و مۆنەوە پێشوازی لیدەکرد ، خۆشی وانیشان دەدا کە بیزار و توڕە نیە و ئەو گرژی و مۆنیەی بە شێوازیکی شارەزایانە لە و پیاوانە دەشاردەوە کە بە ئاسانی هەڵدەخەڵەتین و ساویلکەن ، و ئەویش زۆر ساکارانە پێی ئەوت : ( من لە کچان دەگەم . کچ بە دەم ئەڵیت نا بەڵام دڵی ئەڵیت بەڵی ) .

گەر بە دەست و ویستی خۆی بوایە تفیکی دەکردە نیو چاوانی ، بەڵام ئەو هیچ شتێکی بەویستی خۆی نەبوو ، کاتێکیش باوکی دەبینی خەندەی بۆ دەکات ئەویش ئەو خەندەیەی بۆ دەسەندەوە و پێی دەوت : ( کی بەتۆی وتووە من کچم ) .

ئەوان راهاتبوون لەسەر ئەم پرسیارەی . توڕە نەدەبوون پێی ، بەڵکو بە پیچەوانەوە باوکی کەم تا زۆر دڵشاد دەبوو بەم قسەیەی ، وەك ئەوەی هەستیکی شاراوەی لا دروست بووبیت کە کچەکەی کچ نیە ، یاخود لای خودی نەفسی خۆی بە کچی دانانیت . ئەو دەیزانی کە باوکی لەو بۆچونەیدا ڕاستگۆیە ، و ئەو خوازیار بوو کە نێرینە بوایە . بەڵام دایکی شتێکی تری دەویست و بە مێینەیی بویەتی ، یا لەوانەیە دایکی نەبوبیت ، و ریکەوتیکی کتوپرِ کردبیتیە مێینە .

کاتێک وشەی مێینە دەگەیشت بە گویچکەی دەنگدانەوەیەکی دروست دەکرد ، وەك دەرکەوتنی کۆئەندامیکی قەدەغە لە دەرکەوتن . وەك ئەوەی بۆیەکەمجار بیت کۆئەندامیکی بینیبیت لە ژیانیدا . شەرمی دەکرد کاتێک لە حەمام جلوبەرگەکەی بەری دادەنا ، و نەیدەتوانی لە ئاوینەدا لە جەستەی رووتی خۆی برِوانیت ، و کاتێکیش لە کاتی خۆ شۆریندا پەنجەی بەر کۆئەندامی دەکەوت خێرا دووری دەخستەوە وەك ئەوەی کە پەنجەی بەر ناوچەیەکی کارەبایی یان حەرامکراو کەوتبیت . شوینەواری پیداکیشانی دەستی دایکی هیشتا بە دەستیەوەیە کاتێک کیشاویتی بە دەستیدا لە منداڵیدا . و پەنجە گەورەکانی شوینەواریان جیهیشتووە بەسەر پێستەکەوە وەك نیشانەیەك ، و هیشتا دەنگەکەی لە گوێیدا دەزرنگیتەوە کە پێی دەوت : ( تۆبە بکە ... بڵی تۆبە ) . و ئەو وتنەوەی ئەو وشەیەی رەتکردەوە ، و تۆبەی نەکرد ، و ئەبی چی هەبیت لەو ناوچەیە کە حەرام بیت ؟ و بە ترسیکەوە بە پەنجەکانی ئەو ناوچەیەی تاقیدەکردەوە لەسەر جەستەی ، بە یەکێک لە ڕێگاکان هەستی دەکرد کە شتێکی مەترسیدار لەو ناوچە قەدەغەکراوەدا هەیە ، ناتوانیت دەستی لیبدات ، و ناتوانیت بە چاوەکانی بیبینێت ، بەڵام بوونی هەیە ، بەڕاستی هەست بەبوونی دەکات کاتێک قاچەکانی دەجوڵێنیت ، و پەنجەکانی دایکی هەڵدەلەرزن کاتێک جەستەی دەشۆرن و لەو ناوچەیە نزیك دەبنەوە . بیگومان شتێکی ترسناك هەیە . بەڵام ئەو لە جەستەیدا هەڵدەگریت ، وەك بەشیك لێی ، و لێی جیانابیتەوە . هەندێکجار لەبیری دەکرد و بە یەکێک لەو شتە خەیاڵیانەی دادەنا کە لە منداڵیدا مێشکیان

پڕكردبوو ، هەندێكجاری تریش دەبووە ڕاستیەكی ترسناكی رووت ، وەك وایەریكی كارەبایی هەر كە دەست بەریكەوت رایدەچڵەكینیت .
بهیە .. دەنگی باوكی وەك دەنگی فیشەكیك هاتە گوێی . وەك دەنگی تاكە ڕاستیەك ، لەگەڵیدا زانی كە بهیە شاهینە ، خوێندكارە سەركەوتوەكەی پزیشكی ، ناوناوبانگ خاوین ، پاكیزەی پاك ، كە هیچ مرۆڤیك بەری نەكەوتووە ، و كە بەبی كۆئەندامە سیكسیەكان دروستبووە .
بەتانیەكەی دا بەسەریداو خۆیكرد بە نوستوو ، بەڵام گوێی لە تەقەی پیكانی باوكی بوو لە ژوورەكەی كە لە جیگاكەی نزیك دەبیتەوە ، و پەنجە گەورەكانی بەتانیەكەی لەسەر لا دەبات ، و چاوەكانی سەرنجی چاوەكانی دەدەن ، و بە خورپەیەك هەست دەكات كە بهیە شاهین نیە ، و كچیشی نیە ، و گویرایەڵ و ژیر و پاكیزەش نیە ، و بە كۆئەندامە سیكسیەكانەوە دروستبووە ، و بەدیاری و ئاشكرایی ، و لەژیر بەتانیەكەوە هەستی پیدەكریت و دیارە ، هەروەها لەژیر جلوبەرگەكەیەوە ، نەك هەر دەبینریت ، بەڵكو دەشجوڵیت ، وەك جوڵەی ژیان ، ترپەی هەیە وەك ترپەی دڵ ، بەو جوڵەیە ئەو بەربەستەی لادا كە لە بەردەمیدابوو ، و ئەو تویژاڵكەی پچڕاند كە لە نیوان ئەو ژیاندابوو ، تویژاڵكیكی تەنكی هەست پێكراوی نەبینراو ، وەك پارچە شوشەیەك لەجەستەی جیابكاتەوە ، و لەنیوان و ئەو و ڕاستیدا وەستابیت ، تەنك وەك شوشەو لێیەوە خۆی دەبینیت بەڵام توانای دەستلیدان و هەست پیكردنی نیە . تەواو وەك شوشە بشكیت هەركە جوڵەیەكی بەركەوت .
دایكی دڵی دادەكەوت كاتێک دەیبینی لەسەر پیپلیكانەكانەوە بازی بەرزی دەدا ، و گوێی لە تەپەی دڵی دەبوو و ماسولكەی قاچەكانی گرژ دەبوون ، و جووتی دەكردن و بەرەو لای دایكی دەڕۆیشت ڕۆیشتنیكی كچانەی باو ، قاچەكانی جووت ، و بە ئاستەنگ لیك جیادەكرانەوە ، و لەو كاتەی لەیەكتری جیادەكردنەوە وا دەهات بە خەیاڵیدا كە شتێک لە نیوان رانەكانیەوە بكەویتە خوارەوە ، شتێک لەشیوەی شوشەی شكاودا .
كاتێكیش دایكی دەچوەوە چیشتخانە و ون دەبوو دەستی دەكردەوە بە بازبازین . بە بازی سەر پلیكانەكانیشەوە نەدەوەستا بەڵكو دەچووە سەر لێواری تارمەكەی

مـاڵەوە کە ماڵیـان لە نهـۆمی یەکەم بـوو و خـۆی هەڵـدەداو لە خۆشـی ئەوەی کە جەسـتەی لە هەوادایە بـی هـیچ قورسـیەك هـاواری دەکـرد ، سـوکەڵە وەك زەرِرِەیەکی هەوا ، و زەویش چیتر بۆخۆیی راناکیشیت ، و بۆ هەتـایی لەو بەنـدیە ئاسـنینە رزگـاری بـوو . بەڵام ئەوە تەنهـا بـریتیە لە سـاتەوەختیك وەك چاوتروکانـدنیك ، و پاشـان زەوی بە هیـزە شـیتانەکەیەوە بۆخـۆیی ڕادەکێشـێت و وەك چۆن ئەستیرەیەك دەکشیت ئـاوا دیتە خـوارەوە ، و جەستەی وەك بەردیك لە زەوی دەدات .

هەڵدەسـتایەوە ، و خـۆی دەتەکانـد و خـۆڵەکەی لەخـۆی دەکـردەوە ، و سـەیریکی قۆڵەکانی و قاچەکانی دەکرد . هەموو شتەکان لە جیگەی خۆیـانن ، و ئێسـکەکانی لەجیی خۆیانن و نەشکاون . و بە هەستیکی شاراوە هەست دەکات کە دایکـی فێڵـی لێدەکات ، و هیچ شتێـک ناشـکیك لە جەستەیدا ، و کاتێـک دەرِۆیشـت بـازی دەدا ، و سەربەستانە قاچەکانی دەجوڵاند ، و بەهەموو توانای لیکـی جیـادەکردنەوە ، و ئەو ڕاسـتیەی بـۆ ئاشـکرابوو کە هـیچ شـتێکی شوشـەیی لە نیوانیانـدا نـیە ، و دووبارە دەچووە سەر لێواری تـارمەکەو بـازی دەدایەوە ، سیبارە ، چواربـارە ، و بیسـت بـارە ، و لەهەر جارێکـدا زیـاتر ئەو ڕاسـتەی بـۆ روون دەبـوەوە کە هـیچ شتێک ناشکیت لە جەستەیدا ، و ماسولکەکانی بەهیـزن ، و ئێسـکەکانی پتەون ، ، و ئازادانە قاچەکانی دەجوڵاند لەهەوادا کاتێـک دەرۆیشت وەك چۆن بـراکەی ، و جەستەی ریـك دەکـردەوە ، و سـەری بەرز ، و بە دوو چـاوی ڕەشـی تیـژەوە لە ژیـانی دەرِوانـی ، و پیڵوەکـانی نەدەتروکانـد . و بە متمـانەوە قاچەکـانی لەسـەر زەوی دەجوڵاند ، و کاتێـک دەوەستا قاچی بەرزدەکردەوە بۆسـەر هەر کورسـی و مێزێـک ، و بە تەواوی متمـانەوە بەرزی دەکـردەوە بۆ سـەر هەر لێـواریکی بەرز ، وەك چۆن باوکی لە هۆڵەکە وایدەکرد .

دایکـی دەیـدا بە ئەژنۆیـدا کە دەیبینـی و پێـی دەوت : ( عەیـبە بهـیە ، نابینیـت خوشکەکانت چۆن دەوەستن ؟ ) و سەیری خوشکەکانی دەکرد دەیبینـی چاوەکانیـان نیشتبوو وەك چـاوی لاشـە راکشـاوەکانی سـەر میزەکـانی توێکـاری و قـاچ و رانە ئەسـتورەکانیان جـووت بـوو بەیەکەوە ، و نەشـتەرەکە بە پەنجەکانیـانەوە هەڵدەلەرزی کاتێک لە ڕەحم نزیك دەبوەوە ، یا لە کۆئەندامیکی نێرینە .

ئەو بە نیشتنی چاوەکانیان تورە دەبوو ، و ئەو ڕاستیەی بۆ ئاشکرا دەبوو کە ئەو سەر بەوجۆرە رەگەزە نیە ، و هیچ شتێکی تیادا ناشکیت ، و هەرکاتێک بیەویت چاوەکانی هەڵدەبرِیت و بەرزیان دەکاتەوە ، و لە کویشدا بیەویت جیگیریان دەکات ، و هیزیك نیە لەسەر زەوی بتوانیت چاوەکانی بنیشینیت .

*   *   *

بۆ ڕۆژی دوایی وەك هەموو ڕۆژانی تر چوو بۆ کۆلیج . و چووە هۆڵی توێکاری وەك ڕۆژانی تر . بەڵام هەرگیز چوونە ژوورەوەی وەك ڕۆژانی تر نەبوو ، و قاچەکانی قاچی ئەو نەبوون ، و ئەو دەستانەی کە جانتاکەیان هەڵگرتووە دەستەکانی ئەو نەبوون ، و ئەو چاوانەی سەیری شتەکانی پی دەکرد چاوەکانی ئەو نەبوون . هەرکەس بیبینێت وا هەست دەکات کە ئەوە دوێنێ و پیری و بەسر پیری لیرە بووە . بەڵام بیگومان ئەو نەبوو . یەکێکی تری جیاواز لەم بوو ، و شتەکان لەپێش چاویدا جیاوازیان هەیە . قەبارەیان لە جاران بچوکترە ، و ڕەنگیان کاڵترە ، و جوڵەی هیواشترە . جەستەی خوێندکارەکان بچوکتر دیارە وەك لە جاران ، و قاچی کچەکان جوڵەیان هیواشترە . وەك خشۆکەکان بەسەر زەویدا دەرِۆن ، و بەئاستەم قاچەکان لەیەکتر جیادەبنەوە ، و کە جیاش بوەوە بەخێرایی پیکەوە دەلکینەوە ، بەخێرایی کچ قاچەکانی و رانەکانی جووت دەکاتەوە وەك ئەوەی شتێکی بەنرخ لە نیوانیانەوە بکەویتە خوارەوە لەوکاتەی قاچەکانی جیادەکاتەوە ، و جانتا هەڵئاوساوەکەی بە کتێبەکانی توێکاری بەسەر سنگیەوە بوو ، شتێکی بەنرخی پیدەشاردەوە لە چاوی خوێندکارە کورِەکان و دەست و ئانیشکە تیژەکانیان . و خوێندکارە کچەکان نەیاندەتوانی بە تەنها هاتوچۆ بکەن ، بەڵکو بەردەوام لەشیوەی گروپدابوون ، وەك پۆلە مراوی ، هەر ئەوەندەش کە یەکێکیان هەستیکرد تەنهایە هەنگاوەکانی بە پێڵاوە پاژنە بەرزەکانیەوە خێرا دەکات تا خۆی بگەیەنیتە هاورِیکانی و جەستەی لە نیوانیاندا حەشار بدات .

دکتۆر علوی بینی هاتوچۆی دەکرد لە نیوان میزەکانەوە ، و لە دەرگاکەی پشتەوەی هۆڵی توێکاری چووە دەرەوە . لە گۆرِەپانی کۆلیجدا دەرِۆیشت و

چـاوی دەگێـر ِا وەك ئەوەی بـۆ كەسـێک بـگەر ِێـت . چـووە پێشـانگاكە و بەدەوروپشتی تابلۆكانـدا دەهـاتودەچوو و سـەرنجی هێڵكارییەكـانی نـاو تابلۆكـانی دەدا . چاوە ڕەشەكانیشـی لە نیـو چاوەكـانی تـردا بەشـوین ئەو دوو چـاوە شینە و دەموچاوە باریكەدا دەگەڕا . چووە دەرەوە و لە تـارمەكەدا لەسـەرخۆ دەرۆیشت ، و سـەرنجی روخسـاری خوێنـدكارەكانی دەدا . دەموچاوەكـان هەمـوو لەیەك دەچـن ، و دەنگیان لەیەكتر دەچیت ، و كاتێک سەیری چاویان دەكرد نەیاندەبینی ، و بە تەنـها نوقمی دەریا دەبوو بێئەوەی كەس بیبینێت ، بێئەوەی كەس جیـای بكـاتەوە ، و روخسـاری وەك روخسـاری هـاور ِیكـانی لیهـاتووە و جیـاوازی نـیە لە نیـوان بهیە و علیە و زكیە و ئیفۆن .

بی ئاگایانە بەشەقامەكەدا رۆیشت . گوێی ئاشنایە بە دەنگی پیكـانی ، و شـەقامەكە ئاسـۆیی نـیە وەك شـەقامەكانی دیـكە ، بەڵام بەرز دەبیـتەوە بەرەو سـەرەوە ، و جەستەشی بەرەو سەرەوە دەر ِوات و هەناسە بر ِكیـی پیكەوتـووە ، و چاوەكـانی بر ِیوەتە ئەو خانوە ڕەنـگ خۆڵەمیشیەی وەك ڕەنگی هەور ، بەسـتراونەتەوە بە چەندین تاڵی باریكی نەبینـراو بەو خـانوەوە ، بە هەمـوو توانـایەكی ، وەك جوڵەی خـوێن لە دەمارەكانیـدا ، سـەردەكەوت بەرەو چارەنوسـی هەرچۆنیـك بیـت ئەو چارەنوسە ، هەرچیەك بیت ، گەر مردن و فەنابوونی تەواوەتیش بیت .

بە ترسـیكەوە كلـیلەكەی كـرد بە دەرگـاكەدا ، و چـووە ژوورەوە ، و لە هـۆڵە بەتاڵەكەدا وەستا ، و لیدانەكانی دڵی و هەناسەكانی بیستراوە ، و سنگی هەڵبەز و دابەزیتـی . بە دەنگێكـی هێمن بـانگیكرد : سلیم . بەڵام خـانووەكە چۆڵ بـوو . و سەریسور ِما وەك چۆن لە خەونەكانیدا ، كاتێـک ئەو شتەی بە دەستەوە گرتووە ون دەبیت لە چاوتروكانیكدا ، و ئەو جەستەیە باوەشمان پیاداكردووە نامینیت ، و كـاتێكیش لە تاریكاییـدا چاومـان دەكەینـەوە تەنـها دیـوارەكە و جیگـاكەی ژیرمـان دەبینین .

دەستی بـرد بۆ ئەو شـتەی ژیـری هەسـتیكرد ئەو قەنەفەیەیە كە دوێنـێ لەسـەری دانیشتبوو . و دەستی درێژكرد لە تاریكاییدا و دەستی بەر دیواریكی رەقـی سـارد كەوت . جـارێكی تـر چاوەكـانی نوقانـد و وایزانـی خەون دەبینیت . بەڵام خەونـی نەدەبینــی ، و ئەو ڕاسـتیەی بـۆ دەركەوت كە سـلیم لەوی نـیە ، و ئەو بەتەنـهایە

لەماڵە چۆڵەكەیدا ، و بە ئاگاوە لەسەر قەنەفەكە دانیشتووە . ویستی لەو بەئاگابونەی دڵنیا بیت نەیتوانی . و تەنها ڕێگا بۆ ئەو مەبەستە دەستلیدانی جەستەیتی ، بەڵام ئەو لە خەونەكانیدا وادەكات هەروەها بۆ دلنیابوون لەوەی كە خەوتووە . و ئەو نەتوانینە دەیترسینیت ، و ئەو لە هیچ حاڵەتیكدا ناتوانیت لە هیچ شتێک دڵنیابیت لە ژیانیدا . و هەوڵەكانی بۆ دڵنیابوون تەنها گومانەكانی زیاد دەكات .

كاتێك لە بەیانیدا چاوەكانی كردەوە هەستیكرد ئەوەی لەژێریدایە جیگا ئاساییەكەی خۆی نیە ، و پەنجەرە شوشەكەی بینی و لیوەی چیاكە دیاربوو راچڵەكی و هەستایە سەرپی . و یەكەمین شەوە كە دوور بیت لە ماڵەوە ، و یەكەمین شەوە كە لە جیگایەكی جگە لە جیگاكەی خۆیدا بنویت . هات بە خەیاڵیدا كە باوكی وەك شیریكی درندە دنیای هەڵگیراوەتەوە بەشوینیدا ، دایكی و خوشكوبراكانی و مامەكانی و پورەكانی و ئەندامانی خیزانەكەی هەموو وەك كوللە بە زەویدا بڵاوبوونەتەوە ، و بەدوایدا دەگەڕین .

بەهیواشی بەرەو ئاوینەكە چوو . هەركەسێك ئەو بەیانیە بیبینیایە دەیزانی كە بە جلوبەرگی دەرەوە نوستووە ، سپینەكانی چاوەكانی كەمێك سور بووە ، وەك سورایی دوای گریان ن یان شەونوخونی . ئەو دیمەنەی ئاسایی نەبوو . ئەو كچیكی نمونەیی بوو ، و هەمیشە جلوبەرگەكانی ئوتو بوو ، و سپینەكانی چاوەكانی بەردەوام خاوین بوون و بریتی بوون لە چاوە گەشەكانی كچانی گویرایەڵ ، شەوان لە ناو جیگای خۆیدا دەنویت ، و شەونوخونی نازانیت ، و بیزاری نازانیت ، و لە ژیانیدا بۆ تەنها جارێكیش نەگریاوە .

ئەو بەیانیە نەیدەزانی بۆ كوی بچیت . بەڵام قاچەكانی وەك هەموو ڕۆژانیك بەرەو كۆلیجیان برد و بینی تارمەكانی كۆلیج پڕە لە خوێندكار ، و شەپۆلیكی نائاسایی دەدات لە جوڵەدا . و ئەو قەرەباڵخیەی بڕی بەرەو هۆڵی توێكاری ، بەڵام خوێندكاریك هاتە سەر ڕێگاكەیی و پێی وت :

- ئەمڕۆ مانگرتنە . و نە وانە و نە توێكاری نیە .

بینی هاوڕیكانی بە قاچە جووتەكانیانەوە بەرەو لای دین .

یەكێكیان وتی :

- با خێراکەین بۆماڵەوە تا دڕەنگ نەبووە .

یەکێکی تر پرسی :

- هاتوچۆش دەوەستێت ؟

یەکێکی تر وەڵامیدایەوە :

- ئەڵێن کە کریکارەکانی شەمەندەفەر و پاسەکانیش بەشداری ئەو مانگرتنە دەکەن .

لە هاورِێیەکی پرسی :

- هۆکاری ئەو مانگرتنە چیە ؟

یەکێکیان دای بە پشتیداو وتی :

- نەگبەت ! ئەڵێی بەسەر ئەم دنیایەوە نیت ؟

یەکێکی تر وتی :

- ئەوانە وەك منداڵی ناو مەولوو وان کەمێکی تر تەواو دەبیت و هەریەکە دەچیتەوە بەلای سەعی خۆیدا .

یەکێکی تر گاڵتەجارِیانە وەڵامیدایەوە و وتی :

- خوێندکارانی پزیشکی تەنها وانەکان و خوێندن و بێدەنگیان بەلاوە گرنگە بەڵام خوێندکارانی یاسا و زمانەوانی ، مانگرتنیان بەلاوە جدیە .

یەکێک پیکەنی :

- بابچین بۆ ئەوی .

و بەڵام هاورِێیەکی پەلکیشی کرد بۆلای شەمەندەفەرەکە :

- بابرِۆینەوە بۆ ماڵەوە . تاقیکردنەوەکان مانگیکیان ماوە .

و هەمووکۆبوونەوە ، و بەیەکەوە نوسان ، و بەرەو شەمەندەفەرەکە بەسەرداخراوی ، و چاو نیشتویی و قاچە جووتەکانیان لە جوڵەیەکی وەك کرمی خشۆك رِۆیشتن .

بهیە هەرخۆی بە تەنها مایەوە ، و سەرنجی خوێندکارە کۆبوەکانی دەدا ، و دەیەویت لە نیوان روخسارەکاندا ئەو دەموچاو و روخسارە نائاساییە بدۆزیتەوە ، و ئەتوانیت ئەو دوو چاوە رِەشە کە بەلای شیندا دەرِوانیت دەستنیشان بکات لە نیوان دەموچاوەکاندا . وەستابوو پاڵیدابوەوە بە دیواریکەوە ، و جانتا

هەڵئاوساوەكەی بە كتێبەكانی توێكاری بە دەستەوە گرتبوو ، و چاوی هەڵبرِیبوو و بە نیگەرانی و تورِەییەوە دەگەرِا . خوێندكارانی كۆلیجی پزیشكی خۆشنەدەویست بەتایبەت كاتێک كۆمەڵیان دەبەست . دیمەنی پاڵەپەستۆی چوونە ژوورەوەی كۆلیجیانی لەبەرچاوە ، بە عەینەكە ئەستورەكانیانەوە ، و بە پشتە چەماوەكانیانەوە ، و چاوە ویلەكانیان بەشوین هەرشتێكدا كە تەرِایی گۆشتی تیدابیت .

لەناكاو كەون هەژا . وەك دەنگی زەمین لەرزەیەك زەوی و ئاسمان لەریەوە . و پاش كەمێک زانی كە ئەو دەنگە دەنگی زەمین لەرزە نیە . بەڵكو دەنگی مرۆڤە . و بەهەزاران لە قورِگەكان و لەیەك كاتدا و بە یەك دەنگ هاواردەكەن ، وەك دەنگی ئاسمان لەكاتی هەورەگرمەدا ، وەك ملیۆنان دەنگە كە پیكەوە دەنگێک دروستدەكەن لە كەوندا ، و نەك هەر دەچیتە گویچكەكان بەڵكو پێست دەبرِیت و بۆشاییەكانی جەستە داگیر دەكات ، وەك غازی لیدیت لە چركەیەكدا بڵاودەبیتەوە و وەك خوێن بە هەموو خانەكاندا دەرِوات .

چەند خولەكیك تیپەرِی و بۆ یەكەمجاری بوو گوێی لە هەزاران قورِگ بوو بە یەك دەنگ و بە هەناسەیەكی درێژخایەن هاوار بكات ، بە پانتایی ئاسمان ، پتەو وەك رِەشەبایەك خانوو و درەختەكان لە بنەوە هەڵكەنیت . و بەهۆی بەرزی دەنگەكەوە گویچكەكانی نەیاندەتوانی وشەكان لیك جیا بكەنەوە و تیبگات . پاشان وشەی ( میسر ) لە گویچكەیدا زەنگیدا . ئەو وشەی میسرە ، ئەو وشەیە یا ئەو میسرە نەبوو كە لە دەمی باوكی و دایكی و یەكێک لە مامۆستاكانی یان لە دەمی یەكێک لە هاورِیكانی دەیبیست ، بەڵكو ئەو میسرە زۆر بە هیز و بە دانپیادانانەوەیە ، كەونی پرِكردووە و ئاسمانی هەژاندووە . هەستیكرد مووەكانی سەر جەستەی گرژ بووە ، و جوڵەیەكی گەرم لەژیر پیلوەكانیەوەیەتی وەك جوڵەی فرمێسكەكان كاتێک كۆ دەبنەوە ، و دیمەنەكانی منداڵی هاتەوە پێش چاو ، و سنگی گەرمی دایكی و بۆن و بەرامی شیر لە لوتیدا ، و بۆنی خۆڵ و هەنجیری گوندەكەیان ، و دەستە گەورەكانی باوكی كاتێک دەستی دەگرت لە كاتی پەرِینەوەی شەقامەكاندا ، و دەموچاوە درێژكۆلەكەی پوری كە دەكۆكی و خوێنی دەهێنایەوە ، چاوەكانی خوشكوبراكانی كاتێک هەموو بەیەكەوە دەنوسان

و دەنوستن و دەميان كرابووەوە لەسەر سەرينەكانيان ، و چاوی منداڵە برسيەكانی دەوروبەری حەوز و كانياوەكەی گوند ، و ريزبەندی نەخۆشەكان لە تارمەی نەخۆشخانەكەدا ، و هەناسە سواری ئافرەتان بە و جلوبەرگە خۆڵاوی و ڕەشەكانيانەوە لە دەرەوەی نەخۆشخانە بە دوای تەرميكدا كە لە هۆڵی توێكاريەوە دەهاتە دەرەوە .

فرمێسكەكانی سڕِی و هەر وەستابوو . و هيشتا گرژيەكەی سەر جەستەی هەر مابوو ، و دەنگە بەرزەكان هەر بەردەوامە . و خۆپێشاندانەكە لەبەردەميەوە رۆيشت . و چەندين روخسار و دەموچاوی بەديكرد كە لەوانەی توێكاری نەدەكرد و چەندين جەستە لەوانەی نەدەكرد كە پاڵەپەستۆيان بوو بۆ چوونە ژوورەوەی كۆليج . روخسار و دەموچاوەكان بەرز و دياربوون و پڕِبوون لە خوێن ، و چاوەكان بەرەو بەرزی دەيانڕِوانی ، و پشتەكان ريك بوون بی نوشتانەوە ، و قاچەكان پتەو ماسولكەكانی بەهيز ، و پيكان دەدران بە زەويدا و ئاسمان و درەختی دەهەژاند .

وەك پارچەيەك لەوان خۆيی لە نيوانيانـدا بينيەوە ، وەك بەشيكی جەستەيەكی زەبەلاح ، و گەرمی لە گەرمی ئەوە ، و روخساری دەچيتەوە سەر ئەو و ، و پێستی پڕِبووە لەخوێن ، و لوتی تيژە كەون شەق ئەكات ، و چاوەكانی بۆ پێشەوەيە و ، سەری بەرز ، و پشتی ريك ، و قاچەكانی ماسولكەكانی پتەو بۆتەوە ، و پيكانی لەزەوی دەدات ، و دەيهەژينيت ، بيويستی خۆی دەنگی بە هەموو توانای لە قوڕِگی ديتە دەرەوە و هاوار دەكات : ( ئازادی بۆتۆيە ئەی ميسر ! ) .

هەستيكی سەيری توانەوە لە كەونی زەبەلاحدا ، لە جەستەی بيكۆتايی درێژكراوە ، لەوەی كە مرۆڤ ببيتە بەشيك لە هەمووان ، و بتويتەوە لە هەر شتێكی چواردەوری وەك دڵۆپيك ئاو لە دەريادا ، و زەرڕِەيەك لە هەوادا . هەستيكی سەير ، چيژيكی خۆشی هەيە لەناو دەمدا ، و شادمانيەكی دكتاتۆريانە كە جەستە داوای دەكات ، ، وەك ئەو نەشوەيەی دوێنێ هەستی پيكرد ، لەو جيگا دوورەی ئامێزی چياكە ، وەك ئەو نەشوەيەی كاتێك منداڵ بوو و خوداوەندە خەياڵيەكەی ئەبينی پەستانی دەخستە سەر شتێك و دوايی دەستی دەكردەوە نەمابوو ، وەك

ئەو پێکەنینەی کاتێک دایکی لە باوەشیدا پەستانی دەخستەسەر تا ببنە یەك جەستە .

حەزیکی شاراوە لە جەستەیدا ، لە میژینەیە لە مندالیەوە ، لەو کاتەوەی جەستەیەکی جیاوازی هەیە لە کەوندا ، کە بتویتەوە تا دوا زەرِرِە ، تا رزگاربیت و بی جەستە بیت ، و بی قورساییەك کە کیشی هەبیت ، وەك رۆحیکی سوکی ئازادی لەهەر جیگاو زەمانیکدا وەستاو بی بەربەست بۆ زەوی راکیشیت .

حەزیك بۆ ئازادیەکی دکتاتۆریانەی بی سنور ، دەست مرۆڤ ناکەویت تا ئەوکاتەی تیایدا داوای رزگاربوون دەکات ، و ئەو تویژاڵکە بپسینیت کە لە نیوان ژیان و مردندایە ، لەمردن نەترسیت ، کاتێکیش کە مرۆڤ ترسی مردنی شکاند توانای هەموو شتێکی هەیە لە ژیاندا ، تەنانەت گەر خودی مردنیش بیت .

لەو کاتەدا وا هەستی دەکرد کە جەستەی توانای برِینی ئاسنی هەیە ، و سنگی بەرگەی بەرکەوتنی گوللە و خنجەری ژەهراوی و ئاسایی دەگریت ، و هیچ هیزیك نیە لە جیهاندا بتوانیت جەستەی بخات ، یان جوڵەی قاچەکانی راگریت لە چوون بەرەو پێشەوە ، یان دەنگی کپ بکات لە هاواری ئازادی ، هەرکەسێک لەو ساتەدا لە دەموچاوی برِوانیت لە ڕەشایی چاوەکانیدا ئارەزوویەکی شیتانە بەدیدەکات . کە گەڕانەوە نیە بۆ دواوە . و هیز نیە لە جیهاندا بتوانیت ئەو و ئازادی لیك بکات .

وەك ئەوەی دوای ئەو برِیارەی شڵەژاوی و پەشۆکانی کەم بووبیتەوە ، و نەرمتر بوبیت ، و چیتر ماسولکەکانی بە خاوی نەمانەوە ، و جەستەی شلکرد تا بتویتەوە لە کەوندا ، و لەگەلیدا دەجولا ، وەك ئاوازیك لەگەڵی ریککەوتبوو ، و هەنگاوەکانی وەك سەمایەکی بەکۆمەڵی لیهاتبوو ، و دەنگی هاوارکردن نیە بەڵکو گۆرانیە ، و سەرجەم کەون لەگەلی گۆرانی دەڵێت :

( ولاتەکەم ... ولاتەکەم .. بۆتۆیە خۆشەویستی و ئاواتم ) .

دەنگەکە لە سنگیەوە وەك هەناسەی گەرم دیتە دەرەوە ، و دڵی لە ناوەوە ترپەی دیت ، و ناخی دەکولێیت ، و خەم و پەژارە کۆن و نویکان لەجەستەیدا نوقم بوون و لەگەڵ هەر هەناسەیەکدا ، لەگەڵ هەر ترپەیەکدا ، و چاوەکانی لە خۆشیان

فرمێسكیان دەكرد ، و فرمێسكەكانی دەهاتنە خوارەوە بەسەر روومەتەكانیدا ، و دەچووە دەم و لوتیەوە ، و بەزمانی دەیسوییەوە و پیدەكەنی و گۆرانی دەوت ، و گۆرانیەكەی تیكەڵ بوو بە گریان و هەناسە هەڵكیشان بەڵام نەدەوەستا :

( وڵاتەكەم ... وڵاتەكەم .. بۆتۆیە خۆشەویستی و .... ) .

وشەی خۆشەویستی وەك پارچەیەكی زیندوو لە جەستەی لە دەمیەوە دەهاتە دەرەوە ، وەك تۆپەڵیكی گەرم لە خوێنی ، و بە هەموو توانایەوە ئەو وشەیەی دەوتەوە ، و بە هەموو حەزی خەفەكراوی بۆ خۆشەویستی ، و دەربازبوون وەك باڵندەیەكی ئازاد بە ئاسماندا .

ئایا خۆشەویستیە وای لیكردووە ئەم هەموو هەستەی لا دروست ببیت ؟ و بۆی دەركەوت كە خۆشەویستیە . خۆشەویستی ڕاستەقینە كە توانای ئەوەی هەیە مرۆڤ والیبكات هەموو شتێكی خۆشبویت ، و هەموو خەڵكی ، ئەتوانیت زەوی و ئاسمان و درەخت لە ئامێزگریت ، كاتێك مرۆڤ چاوەكانی دەكاتەوە دەبینیت تەنها جەستەیەكی لە ئامێز گرتووە ، و روخسار و شیوە و سنوری دەرەكی دەناسیت ، و ئەتوانیت ئەو جەستەیە دیاری بكات لەنیو ملیۆنان لە جەستەی تر كە لە كەوندا مەلە دەكەن ، و جیای بكاتەوە ، بە كیانی تایبەتی و دوو چاوی تایبەت كە توانای بینینی و جیاكردنەوەی هەبیت لە نیوان مرۆڤەكاندا .

ئەم جۆرە ساتوەختانە لە خەون دەچن . هەموو ساتە خۆشەكان وەك خەون وان . و لە دەنگی تەقاندنی گوللە بەئاگا هاتەوە . زانی كە ئەو دەنگانە دەنگێكی ڕاستەقینەن كە گوێبیستیتی ، و لەگەڵیدا گەڕایەوە بۆ ژیانی ئێستای ، و بۆ ئەو ئاستەنگانەی بە زەویەوەی دەبەستیتەوە . و چەند گوللە بتەقیایە هیندەی تر بە ئاگا دەهاتەوە ، و بینی هەندێك لە خوێندكارەكان دەكەوتن بە زەویدا ، و هەندێكی تریان سنگی دەبردە پێشەوە بۆ گوللەكان ، و هەندێكی تریان خۆی دەدایە پاڵ دیواری خانوو و دوكانەكان .

وەك پەیكەریك لە جیگەی خۆی وەستا ، بە باڵایەكی بەرزی سەربەرزی پتەو . و گەر گوللەیەك لە رووی بتەقینرایە دەستبەجی دەكەوت بە زەویداو دەمرد . بەڵام ئەو دەیزانی كە بەبی ویستی خۆی نامریت ، و هیشتاش بڕیاری مردنی نەداوە ، بەڵام دەیەویت بگری ، و خەم و پەژارە تاكە ڕاستیەكە لە ژیانیدا ، ئەو كاتێك كە پیدەكەنی ، پینەدەكەنی ، و كاتێكیش كە شادمان دەبوو لە ناخی خۆیدا

هەستی دەکرد کە ئەو بەختەوەرییە ڕاستەقینە نیە ، و شتێکی شاراوە هەڕەشەی لێدەکات ، و هەڕەشە لە ژیانی دەکات ، و ویستیکی تر خۆی بۆ مەڵاسداوە ، لە هەموو ساتەکاندا ، و لەهەموو جیگاکاندا ، بۆ فرسەتیك دەگەڕِیت پیوەی بدات ، و کەسیش فریای ناکەویت ، نە دایکی و نە باوکی و نە خوشکوبراکانی و هیچ کەسێک .

لەناکاو ، وەك ئەوەی زەوی بووبیت بە دوو بەشەوە ، دەم و چاوی ( سلیم ) ی بینی .

لەسەر زەویەکە کەوتبوو و جەستەی خوێنی لی دەچۆڕِا . و سەرجەم تابلۆ و دیمەنەکان لەپێش چاوی بڵاوبوونەوە ، و تەنها ئەو روخسارە جیاوازە نەبی لە هەمووان کە وردە وردە بەرەو لای دەچیت ، و سەری خواربووبوەوە ، و خوێنە سورەکەی کراسە سپیەکەی شڵاڵ کردبوو ، و لە پشتیەوەی هیڵیکی درێژی سوری کیشابوو .

وەك خەونیك رامابوو لە نیوان ئەوەی بڕِوابکات یان ئەوە خەونیکە ، لە ژوریکی تەنیشت هۆڵی نەشتەرگەریەکەوە لە نەخۆشخانەی ( قصر العيني ) دانیشتبوو . چەندین رووداوی گەورە لە ساتوەختیکی کەمدا روویدا گە جیگەی بڕِوا نین ، بەڵام چاوە ڕەشەکانی سلیم کە بەلای شیندایە ڕاستی ئەو رووداوانە ئاشکرا دەکات ، کاتێکیش لە ژوورەکە نامینیت شتەکانی دەوروبەری ڕاستیەکانیان و بونیان لە دەست دەدەن و کاتێک دەگەڕِیتەوە بۆلای و سەرنجی چاوەکانی دەدات ڕاستی شتەکان و بونیانی بۆ دەسەلمیت ، و دەزانیت کە ئەم ساتە بریتیە لە تەمەنی ڕاستەقینەی ، و ئەو ڕۆژ و ساڵانەی پێشتر تیپەڕِیون تەنها خەیاڵ و ئەفسانە بوون .

لەناو دەمیدا هەستی بە چیژی ژیان کرد کە گەرم و کتوپڕِ بوو ، لەکاتێکدا تیکەڵ بووە بە بۆن و بەرامەی ماددەی ( ئەسیر ) و بۆیەی یۆد کە لە نەشتەرگەریدا بەکاردەهینرین ، هەروەك هەستی بە گرژیەك کرد لە دەستەکانیدا کاتێک دەستی دەدایە شتێک ، و لە کاتی وەستانیشدا پیکانی میرولەیان دەکرد ، هەستکردن بە ژیانیکی ڕاستەقینە ، تیکەڵەیەك لە ترس و سووربوون ، و هەستکردن بە مەترسی و ئارامی ، ونکردنی هەستکردن بە کات و شوین .

تیكهڵەیەكی سەیر لە هەستە نا یەكسانەكان كە هەموو لە تەنها دەفریكدا تیكهڵبوون و تواونەتەوە .

واهات بە خەیاڵیدا كە سەرجەم جیهان لە پیناو وەدەستهێنانی ئەم تیكهڵەیە لە جەستەیدا كەوتونەتە جوڵە ، و مانگرتن و خۆپێشاندان و هاواركردن و تەقاندنی گوللەكان ، و ئەو جەستانەی كەوتن ، و ئەو خوێنە سورەی لەسەر زەوی ر ِژا ، و ئەو سەرە نەزیفەی هاوكاری كرد بۆ هەڵگرتنی بۆ ناو عەرەبانەكە ، و ژووری نەشتەرگەری ، و بۆن و بەرامی ئەسیر و بۆیەی یۆد ، و پزیشكەكان بە چاكەتە سپیەكانیانەوە ، و پەریستارەكان ، ئەمانە هەموو روویانداوە لە پیناو وەدەستهێنانی ئەو تیكهڵەیە لە جەستەیدا .

هەركەس لەو كاتەدا لە چاوەكانی بر ِوانیایە خەم و پەژارەیەكی قوڵی شاراوەی بەدی دەكرد تیكەڵ بە بەختەوەرییەكی دكتاتۆریانەی توندر ِەو ، وەك بریسكەیەك لە ڕەشایی چاوەكانیدا ، وەك جوڵەیەكی خێرا ، و بەركەوتنی هەوایەكی گەرم ، وەك هەناسە بر ِكیی منداڵیكی شوینكەوتووی تۆپیك ، وەك باڵە فر ِەی باڵندەیەك لەژیر تیشكی خۆردا . گوێی لە دەنگی یەكێك لە پزیشكەكان بوو وتی :

- مجدی مرد .

دەنگەكە وەك گوللەیەك گویچكەكانی بر ِی و بەربەستی نیوان خەون و ڕاستی پساند ، نیوانی ژیان و مردن ، بەئاشكرا زانی كە حەوت لە خوێندكارەكان مردوون ، و ژمارەیەكی زۆرتریش برینداربوون ، و ژمارەیەكی تریان بە ئوتومبیل براونەتە بەندیخانە ، و میسر ئازاد نیە ، و كۆت و بەندیەكان هیشتا ماون ، و چاوەكانی منداڵە برسیەكانی نزیك كانیاوەكە وەك خۆیانن ، و ریز بەندیەكانی نەخۆشەكان لە گۆر ِەپانی نەخۆشخانەكاندا ماوەتەوە و خوێن دەهینەوە ، و ئافرەتانیش بە جلوبەرگە ڕەشەكانیانەوە هەر دەگرین و هەناسە هەڵدەكیشن ، و باوكی لە هۆڵەكەدا هەر لەسەر كورسیەكەی خۆیەتی ، و پۆلیسەكەی سەر سوچی كۆڵانەكە لەو دیو دوكانەكەوە هیشتا هر بۆنی خوێنەكە دەكات و لێی ورد دەبیتەوە .

ســـەری داخســـت وەك ئەوەی نوســـتبێت ، و لەوانەیە بەڕاســـتی نوســـتبێت ، لەبەرئەوەی لە دەنگی سلیم بەئاگا هاتەوە ، و کاتێکیش سلیم بانگی دەکات هەموو شتەکان دەبنە خەون :

- بهیە .

لەسەر کورسیەکە بەو دەنگە راچڵەکی .. بهیە .. ، جیا لە هەموو ناوەکانی دیکە ناوی ئەم دەبات ، جگە لە هەموو دەم و چاوەکان روخساری ئەو دەناسیتەوە ، و بە جوڵەیەکی خۆنەویستانە بەرەو لای دەچێت ، دەنگی لە گوێیدا دەزرنگێتەوە : بهیە ، تۆ هیلاکیت ، و جلوبەرگەکانت خوێنیان پێوەیە . سەیریکی جلوبەرگەکەی کـرد ، بینــی چەنــد پەڵە خوێنیــك بە سەرسـنگیەوەیەتی ، خــوێنی مجـدی کە لە دەمارەکانیدا چەند خولەکێك لەمەوبەر بەستویەتی . دکتۆر فەوزی وتی :

- سـلیم تـۆش کراسـەکەت هەمـووی خـوێنە . وەرن لەگەڵـم بـۆ خـانەی پزیشکان و لەوی ئەتوانین ئەو خوێنە لێبکەینەوە .

خـانەی پزیشـکان لە نەخۆشـخانە نـویکەی قصـرالعینی بـوو ، و لە حەوشـەیەکی بچکـۆلانەوە مـاوەی نیـوانی هەردوو نەخۆشـخانەکەیان بـرِی ، و لە خـوارەوە ئاویـك هەبـوو بەلەمیکـی بچکۆلانەی تیـدابوو کـورِو کچیکـی تیـدابوون سـەوڵیان لیدەدا و پیدەکەنین و دەستیان بۆ ئـافرەتیکی موو زەرد بەرزدەکردەوە لە یەکێـک لە تـارمەی کۆشـکەکانی ( گـاردن سیتی ) وەستابوو ، و لەبەردەرگـای نەخۆشـخانە خەڵکیکـی زۆر وەستابوو ، و عەرەبـانە دەسـتیەکانی لیبـوون بە بـارە پرتەقـاڵەوە ، و روخسـارە لاوازەکـان ، و جەسـتە پەیکەرییەکـان ، و ئافرەتانیـك منـداڵیان بە باوەشـەوە بـوو روخسـاری پیریـان هەبـوو ، و پیرەکـانیش جەسـتەیان بچـووك وەك منـداڵان بەڕێگـادا دەڕۆیشـتن ، و ئافرەتانیـك لە پیـاو دەچـوون ، و پیاوانیـك لە ئافرەتانیـان دەکـرد ، و لەسـەر شۆسـتە چیمەنتـۆکەش تفـی خوێنـاوی هەبـوون ، و پاشـەرۆی منداڵان ، و چەنـدین سـەگی بەرِەڵا لە خۆڵ و خاشـاکی بڵاوی ئەو ناوەدا بۆ خواردن دەگەڕا .

لە پشتیانەوە هۆرِینیکی بەرزی ئۆتومبیلێك لیدرا ، ئۆتـومبیلێکی ڕەشـی درێژیـان بینـی چـوار دەم و چـاو ئەستوری تیدابوو لەگەڵ هەشـت چـاوی برسـی . بە چرپە سلیم وتـی :

- پۆلیس .

کابرایەك لێیان هاتە پێشەوە دەمی گرنجگرنج و درێژ وەك دەمی مشك و پێی وتن :

- لەگەڵ من وەرن .

هیچکامیان نەجوڵان و سی پیاو ئەملاولایان گرتن و لەگەڵیان بەرەو ئوتومبیلە درێژەکەی چوون کە لە سندوقی دەکرد ، و لە هەرچوارلایەوە گیرابوو لە بەندیخانەیەکی جولاوی دەکرد .

کورسیەکەی بە تەنیشت لایەکیەوە بوو وەك شوینی کلیل و لێیەوە شەقامە جەنجاڵەکانی بە خەڵکی ، و ئوتومبیلەکان ، و شەمەندەفەر. خەریك بوو ڕۆژ ئاوا دەبوو و گڵۆپی ماڵ و شەقامەکان و دوکانەکان وردەوردە بڵاودەبوونەوە ، و لەگەڵی جوڵەی هێمنی شەو دەستی پیدەکرد کە خەڵکی دەچوونەدەرەوە بۆ پیاسەکردن و شەو بەسەربردن ن یان بۆ کارکردنی شەوانە یان بۆ کرِینی پیداویستیەکانیان . لە نیوانی ئەو کونە بچکۆلانەیەوە لە جیهانیکی تر دەرِوانیت ، وەك ئەو جیهانە بچکۆلەیەی لە سندوقی دونیاوە لە منداڵیدا لە کونە بچکۆلانەکەوە سەیری دەکرد .

جوڵەی شەقامەکە و خەڵکیشی بەلاوە سەیر بوو ، تەواو جیاواز لەو جیهانەی تییدایە ، و هیچی لەبارەوە نازانیت ، ناوی خواردنە یا خواردنەوە یا نوستن ، یا خانوو یان باوکان یا دایکان ، یا دوکانەکان ، یا ئەو خەڵکەی شتومەك دەکرِن ، یان منداڵان لەدایك دەبن ، یا پیروپەککەوتە دەمرن ، یا شەقامەکان خەڵکانی پیدا دەگوزەرن ، یا شەمەندەفەرەکان بەسەر سکەکاندا دەرِۆن . و وا هاتە پێشچاوی کە جوڵەی خەڵکی جوڵەیەکی بی واتایە ، و هات بە خەیاڵیدا کە ئەو خەڵکە مردوون یان لە جیهانیکدا دەژین نە گەرمی و جوڵەی تێدایە نە ترپە و لیدان .

جیهانی خەڵکانیك لە چاوی ئەودا مردوون ، و تەواوی جیهان کۆبۆتەوە و بریتیە لەو ئوتومبیلە ، یان ئەو سندوقە داخراوە ، یا بە واتایەکی تر ئەو کورسیە بچکۆلانەیەی پاڵیداوەتەوە بەلایەکی سندوقەکەوە و جەستەیەکی لاوازی سستی بە روخساریکی باریك دوو چاوی قوڵەوەی لەسەر دانیشتووە کە توانای بینینی ناخی ڕاستەقینەی شتەکانی هەیە .

ئوتومبیلەكە وەستا ن و دەرگای سندوقەكە كرایەوە ، و ژمارەیەك لە پیاوان هاتن و لەپێش و دوایەوە ڕۆیشتن ، لەگەڵیان چووە بینایەكی سەیرەوە ، و خۆی لە ژووریكی تەنگەبەری بەتاڵدا بینیەوە . و دەرگاكەی لەسەر داخرا . و چاوی بڕیـیە دەرگاكە كە هەر ئەوی ئەبینی . بەربەستیكی ئەستوری لە تەختە دروستكراو ، لە نیوانی ئەو و سلیمدایە . و لەنیوان ئەو و ژیانیدا دانراوە و وەستاوە ، و ناهیڵیت جوڵە بكات ، و بۆخۆیی ڕادەكێشێت بەبی ویستی خۆی وەك چۆن لە منداڵیدا دایكی رایدەكیشایە ئامێزی خۆی بە قۆڵە گەورەكانی ، و دەنگی بەرزی باوكی كە دەیدا بە گوێیدا ، و دەنگی شەمەندەفەرەكە كە بەسەر سكەكاندا دەڕۆیشت ، ، و دەرگا ئاسنینەكەی كۆلیج ، و هۆڵی توێكاری و میزەكان كە لاشەكانیان لەسەربوو ، و قاچە خواروخیچەكانی خوێندكاران و چاوە شكاو و نیشتوەكانیان ، و چاوە شینە متەكانی دكتۆر علوی .
بە مستەكۆڵە بە هەموو توانای لەدەرگا تەختەكەی دەدا ، و بە قاچی چەپی و ڕاستی لە دەرگا ئەستورە دەنگبڕەكەی دەدا ، و بەڵام جەستەی دەگەڕایەوە بۆ دواوە و دەیدا بە دیوارەكەدا ، و دواجار دیوارەكە دەمایەوە و سەری دەشكا . بەڵام سەری ناشكیت . هیچ شتێكی تیادا ناشكیت . و جەستە درێژەكەی لەسەر زەویەكە دەمینیتەوە ، و بە درێژایی نیوانی دەرگاكە بۆ دیوارەكەیە ، و لەژیریەوە هیڵی باریكی خوێن هەیە كە لە گویچكەكانی و لوتی و نیوانی پەنجەكانی دەستی و قاچیەوە دیتە دەرەوە ، و پۆلیسەكە دەرگاكە دەكاتەوە ، و بۆنی خوێنەكە دەكات ، و چاوەكانی دزەدزیانە ، و ئەویش بە دوو چاوە ڕەشەكانیەوە لێی دەڕوانیت ، و وەك هەموو پیاویكی پۆلیس سەر شۆڕ دەكاتەوە بۆ زەویەكە ، و سەریك بەرز دەكاتەوە و دەیەوێت ماسولكەكانی توند بكاتەوە و شوڵكیكیشی بە دەستەوەیە وەك جەللاد .
هەموو شتەكانی دەوروبەری ئاساییە وەك ئەوەی چەندجارێكی تر دووبارە بووبنەوە ، و ئازاری جەستەشی پێشتر هەستی پیكردبوو ، و ئەو دڵۆپە سورانەی سەر زەویەكە ، بەڵكو ئەو پۆلیسەشی بینیبوو ، و چاوەكان ، و ولوت ، و شوڵكەكە ، و دیوار ، و دڵۆپە سورەكان ، و دەرگاكە ، و هەموو شتەكان دووبارە دەبنەوە ، وەك ئەوەی بزانیت بەیانی چی ڕوودەدات ، و كاغەزە

سپیەکەی لەژێر سەرینەکەی دەیشاردەوە ، وەك چۆن لە چاوەکانی باوکی دەشاردەوە ، و کاتێک مەئموری بەندیخانەکە دەچووە دەرەوە کاغەزەکەی دەردەهێنایەوە ، و سەیری هێڵە دیاریکراوەکانی دەکرد ، هێڵەکان وەك روخساری خۆی دەناسیت ، بەو جوڵە بەهێزە خۆنەویستیەوە فلْچەکە دەجوڵێنیت لەسەر رووی کاغەزە سپیەکە ، و سەرجەم شتەکان شێوازیکی نوی و ڕەنگیکی نوی وەردەگرن ، یان بە واتایەکی تر ڕەنگە ڕاستەقینەکانیان وەردەگرن . وای لیدیت چاوەکانی بتوانن ئەوە لیك جیابکەنەوە کە گەڵای درەختەکان سەوز نین ، و ئاسمان ڕەنگی شین نیە ، و دیوار خۆڵەمیشی نیە ، بەڵکو بێدەنگ و دەنگبریش نیە ، بەڵکو تەنکە وەك پەردەیەکی حەریر ، جەستەی دەتوانیت بەئاسانی بیبەزێنیت ، و ئەو هەست بە هێزیکی زۆر دەکات ، ڕاستەقینەیە و خەیاڵی نیە ، و چڕییەکی توندی هەیە ، بە پەنجەکانی هەستی پیدەکات پتەو و نەرمە وەك مەتات ، ناشکیت بەڵکو لەگەڵ پەستانیکی زۆر دەنوشتیتەوە ، هەست دەکات کە جەستەی نایەویت لە ژیان بگەڕیتە دواوە ، و دڵی بەردەوام دەبیت لە لیدان بەو لیدانە بەرزانەی لە قاقا دەکات ، و شتەکان ڕەنگیکی کراوە دەپۆشن ، ودڵۆپە خوێنەکانی سەر زەوی پرشنگ دەدەنەوە وەك تیشکی خۆر ، و پرشنگی ئەستیرەکان زیاتر دەبن وەك پرشنگی مانگ ، و سەوزایی درەختەکان دەبیتە شینیکی تاریك ، و هەر گەڵایەك چەند هیڵیکی بەرزی دیاری گرنجگرنجی پیوەیە ، و هەوا بە لەرینەوەیەکی نادیار وەك زەمەن دەیجوڵێنیت ، و رابردوو وەك ئێستا و داهاتووی لیدیت ، و دوێنێ وەك ئەمڕۆ و وەك بەیانی وایە ، و زەمەن جیاواز دەبیت لەم زەمەنە ، و ئەمە ڕاستیەکی گەورەیە مرۆڤ تەنها لە بەندیخانەدا بۆی ئاشکرا دەبیت .

ئەم دۆزینەوەیە یان ئەم هەستە هۆکاری ڕاستەقینەی ئەو نەشوەیە بوو کە لە چاوە ڕەشەکانیەوە دیاربوو ، کە وایدەکرد جەستە خوێناویەکەی سەما بکات ، و دەستبازی بکات لەگەڵ ئەو پەڵانەی سەر کاغەزەکە . کە ئەمە توانایەکی ئیجگار بەهێزە ، جەستە ناتوانیت پێی ئاشنا ببیت یا بیدۆزیتەوە تا لە هەستی مرۆڤانەی ساختەی دەرباز نەبیت و ببیتە خاوەنی هەستی ڕاستەقینەی .

كاتێـك پاسـەوانەكە سـەری هێنـایە ژوورەوە . سەریسـورِمـا لەوەی كە بهـیە دەستەكانی بەرز كردۆتەوە و سەما دەكات و لەگەڵ سورِی خوێن لە جەستەیدا پیدەكەنیت ، چونكە مرۆڤ هەزاران ساڵە دەیەویت لەرِێگەی سورِی خوێنیەوە لە كەون تیبگـات ، و بهـیە بە چـاوە رِەشـەكانیەوە لە پۆلیسـەكە ورد دەبیـتەوە ، و بـۆی دەردەكەویـت كە بە رِاسـتی كەون لەگەڵ سـورِی خوێنـدا لە جەسـتەیدا دەسورِیتەوە ، و هەر ئەو سورِانەوەیەشـە كە پیاوانی پۆلیسـی ترسـاندووە ، و بیـری شـیواندوون ، بەتـایبەت گەر سـورِانەكە بەهیـز بـوو تـا رادەی ئەوەی رووەكەی ساف و لوس بیت وەك رووی زەوی ، لەگەڵ ئەوەی كە رِەنگـی سورە وەك رِەنگی خوێن .

پۆلیسەكە بە دەنگێكی تیژی مێینەیی لێی پرسی :

- تۆی بهیە شاهین .

دەسـتبەجی و بە پێكەنـین و بەردەوامـی لە جـوڵەی خـۆی و سـەر بەرزیەكەوە وەڵامیدایەوە :

- نەخێر .

پۆلیسەكە بە دوو چاوی سستەوە لێی ورد بووەوە و وتی :

- درۆ دەكەیت ؟

پیكەنـی و پەنجەكـانی دەتەقانـد زسّیەكـی لیـدا تاڵیـك خـوێن لە دەم و لـوتی هـاتە خـوارەوە ، بەڵام چـاوە رِەشـەكانی هەر بـۆ بەرزی دەیـانرِوانـی ، و بە لـوتی كەونی كردووە بە دوو بەشـەوە ، و كاتێـك چووە نزیك پۆلیسـەكە ، قاچەكـانی لە پـانتۆڵە رِەشـەكەدا درێژبـوون ، و ماسولكەكانی پتەون ، و ئێسـكەكانی ریك ، بە متمـانەوە لە زەویـان دادەنیـت و لیكیـان جیـا دەكـاتەوە ، و كاتێـك چـووە ژوورە قەرەبـاڵخەكەوە ، و لە نیـوان هەمـوو جەسـتەكاندا ، ئەم وەك هەمیشـە وەسـتا قاچێكی لەسەر زەوی و قاچەكەی تری بەرزكردەوە بۆ سەر لێواری ئەو میزەی كە لەودیویەوە ئەفسەریك دانیشتبوو .

ئەفسەرەكە دەفتەریكی گەورەی كردەوە و هاواریكرد :

- بهیە شاهین .

زانــی کە کەسـێکی تــر بانــگ دەکــات وەڵامــی نەدایەوە . بەڵام جــارێکی تــر بە دەنگێکی بەرز بانگیکرد :

- بهیە شاهین .

و بە چــواردەوری خۆیــدا دەگەڕا لەنیــوان روخســار و دەم و چاوەکانــدا بــۆ روخسـاری بهـیە شـاهین . روخسـاری بـۆ جیـا نەکـرایەوە لەنیـوان روخسـاری ئافرەتەکانــدا لەوانەی دانیشــتبوون و لەوانەشــی بە پیــوە وەســتابوون . و لە ژوورەکەدا پێکەنینێکی مێینەیی بەرز دەنگیدایەوە و بە دوایدا چەندین پێکەنینی تــر تــیکەڵ بە بــۆنی عەرەق و بنیشــت و لیــو کرۆشــتن ، وەك بــۆنی یــۆد ، و روخســاری هەنــدێک باریــك و لاواز وەك ئەوەی پێســتەکە درابیــت بەســەر ئێسـکەکەیدا و هەنـدێکی تـر قەڵە و و گۆشـتن لە گەرمـادا ژێـر چاوەکـانی ڕەش ببـون وەك چەنەوەری لیهـاتبوو ، جەسـتە قەڵەوەکە لەژێـر جلـوبەرگە حەریـریە تەنـگەکەوە ، و لەریـنەوەی مەمکەکـان ، و جەسـتە لاوازەکـانیش بەبـی مەمـك و شـان و مـل ، و قـاچە مێیـنەیە بچکۆلانەکـان لە پاپوجەکـانەوە هـاتبوونە دەرەوە بە نینۆکە درێژە سورەکانیانەوە و پاژنە قڵیشاوەکانیان و ڕەش بوو بە قورِ .

یەکێک لە ئافرەتەکان وتی :

- بهیە شاهین لەکوییە ؟

یەکێک لە قەڵەوەکان وەڵامیدایەوە :

- من ناوم بهیە شربتلیە .
- خۆشحاڵم خوشکم .
- من خۆشحاڵم .
- کەی خوا لیمان دەبوریت ؟
- خوا زۆر لیمان رازیە .
- ئەی پیغەمبەر خوشکم ؟
- بیگومان . ئیمە کە باشترین ئافرەتانیکین .
- متمانەیت بۆ گیرِامەوە خوشکم .
- گەر ئـیمە نەبـین میردەکــان و شــەرەفەکان هەمــوو دەمــردن ، و مــاڵە بەرِیزەکان خاپور دەبوون .
- بەڵام ئەوان بۆنی ئیمەیان پیناخۆشە .

- لەبەرئەوەی بۆنی ڕاستەقینەیانە .
- و ئەمانخەنە بەندیخانەوە .
- لەبەرئەوەی شیوەی کۆئەندامەکانیان دەزانین .
- و تا رادەی مردن لیمان دەترسن .
- و حەزیان بە مردنمانە .

دەنگی پێکەنینەکان و تاقوتریقی بنیشتەکان و پاپوجەکان دەنگیدەدایەوە ، و بۆگەنیکی ناخۆش بڵاو بووبوەوە .

ئەفسەرەکە بە هەموو تواناى دەستیدا بەسەر میزەکەی بەردەمی کە وەك میزی چیشتخانە وابوو و بە توڕەییەوە وتی :

- بێدەنگی قەرەجینە ! شەرم ناکەن ؟

یەکێک گاڵتەجاڕیانە پیکەنی و وتی :

- شەرمی چی جەناب ؟ ئەوانەی شەرمیان دەکرد مردوون .

پیاویك دەستیکی هێنا بە سمیڵیدا و وتی :

- بەخوا ڕاستدەکەیت .

بە چاویکی پڕ ِ حەزی شەهوەت تیربارانیکرد .

لیوەکانی بهیە خەندەیەکیان کرد و خێرا جووت بوونەوە کاتێک باوکی بینی لەبەردەمیدا ، وەك ئەوە وابوو زەوی قڵیشابیت . باوکی بە تیلەیەکی چاو سەیریکی کرد ، و وەڵامی پرسیارەکانی ئەفسەرەکەی دەدایەوە ، و ئیمزایەکی خستە سەر داواکەی بەردەمی ، و غەرامەی ( دە جونەیهی ) دا پێش ئەوەی کچەکەی وەرگریتەوە .

سواری تەکسیەکە بوو ، و دانیشت ، و لای چەپیەوە باوکی دانیشت ، و لای ڕاستیشی مامی . و دەرگای ئوتومبیلەکە داخران و ڕۆیشتن ، وەك لەلایەن دەسەڵاتیکی لیکچووی وەك پۆلیس دەستگیرکرابیت دووبارە ، و باوکی لەلایەك و مامی لەلایەك بێئەوەی سەیری بکەن وەك دوو پۆلیس دەم و چاویان بۆ پێشەوە وەك ئەوەی ڕاپێچی بکەن بۆ سیدارە یا بۆ زیندان .

پیاوانی خیزان کۆبونەوە لە دەوری میزی نانخواردنەکە و دەستیانکرد بە خواردنی بریانی مریشك . و لە دوای نانی نیوەر ِۆ لە هۆڵەکە دانیشتن و دەستیانکرد بە جگەرە کیشان ، یەکی بە چیلکەیەکیش ددانەکانیان پاك دەکردوە و

یەکێکیان لە زۆرخۆریدا ورگی شۆڕِبووبوەوە وەك ئافرەتی دووگیان ، و سمت و رانە ئەستورەکانی کورسیەکەی پڕِکردبوو . یەکێکیان بە دەنگیگی گرِی نەشازەوە کە لە دەنگی خۆیی نەدەکرد وتی :
- بە رای من دەری بهینین لە زانکۆ . زانکۆ رەوشتی کچان دەشیوینیت .
یەکێکی تر وەڵامیدایەوە :
- من رام وایە بە خێرایی بەشووی بدەین ، چونکە هاوسەری بوون بەربەستیکی پتەوە بۆ رەوشتی کچ .
یەکێکی تر وتی : من پیم باشە هەردوو کارەکە بەیەکەوە بکەین . بە واتایەکی تر لە زانکۆ دەریبکەین و بەشووی بدەین ، زاواکەش ئامادەیە .
ئەو لە دەستی قەدەردایە ، و ماوەی شیشیك بۆ یەکێکی تر زۆر کەمە و ناتوانیت سەری لیوە بهینیتە دەرەوە . قەدەر باوکیتی . ئەو خاوەنیتی بە جلوبەرگەکانی ژیرەوەشی بیخاتە بەرخوێندن یان بە پیچەوانەوە . ئەو خەرجی کۆلیج دەدات . بەشووی بدات یان نا ئەو بریکاریتی لەگەڵ ئەوەی ڕێگەی ئەوەی پینەداوە واتە نەیکردۆتە بریکاری خۆی .
موئامەرەکە لە دەوری توند بووە ، بەبی دەنگی و بە نهێنی ، گوێی لە چپەچپە ، و تێڕوانینەکان ئەبینیت لە چاوەکاندا ، و هەست بە نزیکبوونەوەی مەترسی دەکات و بیر لە ڕێگایەك دەکاتەوە بۆ رزگاربوون .
لە نیوەی شەودا کاتێک گوێی لە پرخەی باوکی ئەبیت لە جیگاکەی دیتە دەرەوە و جلوبەرگی دەرەوە لەبەردەکات ، و لەسەر لێواری سیسەمەکەی دادەنیشیت بیردەکاتەوە بچیت بۆکوی ، لەم کاتەدا ، کچیکی تەمەن هەژدە ساڵان لەم کاتەدا پێویستە بۆ کوی بچیت ؟.
ئەو هەستی نەدەکرد کە کچە ، یان لە تەمەنی هەژدە ساڵیدایە . ئەو تەمەنە لەو سەردەمەدا پێی دەوترا تەمەنی هەرزەیی . وشەی هەرزەیی وشەیەکی قیزەونی ترسناکە ، هەرئەوەندە کە بیسترا باوکان و دایکان ئەترسن لە حەزیکی سیکسی خەفەکراو ، و بەردەوام لە ئاستیدا دەم و چاویان گرژ دەکەن ، و پەنجە هەڕەشە ئامێزەکانیان لە کوڕِ و کچەکانیان بەرز دەکەنەوە و خەڵکیش بە وریاییەوە لیان ورد دەبنەوە ، بەڵام دایکان و باوکان دوای غەریزەکانیان ئەکەون بێئەوەی کەس بیانخاتە ژیر چاودیری و سڵیان لیبکات .

ئەو دەیزانی كە ئەوان هەڵهاتنی لە ماڵەوە بۆ هۆكارە سیكسیەكان دەگێرِنەوە ، لەگەڵ ئەوەی ئەو لەو كاتەدا هیچ حەزیكی سیكسی نەبوو ( پەیوەندی لەگەڵ سلیم شتێكی تر بوو ) . لەو ڕۆژەوەی كە دایكی كیشاویتی بە دەستیدا ( لە تەمەنی سی ساڵیدا بوو ) دڵی تیكەڵ دیت هەركە كۆئەندامیكی كورِیك یا كچیك ببینیت . و كاتێكیش كە كۆئەندامەكانی خۆی لە حەمامدا ئەبینیت خێرا روویان لی لادەدات . بە واتایەكی تر ئەو نەیدەزانی كە مێینەیە ، و سلیمیش لەپێش چاوی نێرینە نەبوو . لە چاویدا وینەی ڕاستەقینەی خۆیی دەبینی ، و جوڵەی بەرەو لای ئازادی و ویستی ئەسەلمینیت ، و كاتێك لەگەڵیدا دەبوو حەزی بۆ خواردن لەدەست دەدا ، و هەروەها حەزی سیكسیشی ، و دەبووە مرۆڤیكی نویی بی ئەو غەریزە ناسراوانە ، بەڵكو حەزیكی پرِی زۆری بی ناوە ، حەزیك كە ببیتە خودی ڕاستەقینەی مرۆڤ ، كە بە ویستی خۆی پی لە ئارەزووەكانی تری بنی ، و بەڵگەنامەی لە دایكبونەكەی بدرِینیت ، و ناوی خۆی بگۆرِیت ، و دایكی و باوكی بگۆرِیت ، پەنجە بكات بە چاوی هەموو ئەوانەی درۆیان لەگەڵ كردووە یان فێڵیان لیكردووە ، چاوەكانی خۆشی لی بەدەر نەكات و دەریان بهینیت و دووچاوی نوییان بخاتە جیگە .

دەیزانی كە چاوەكانی درۆ دەكەن و حەزە سیكسیەكانی دەشارنەوە . بەڵام بە ویستی خۆی نەیدەشاردەوە . بەڵكو خودی خۆی وا دەردەكەوتن ویرِای نەویستنی ئەو ، و هەستی پیدەكرد كە لێی دووردەكەوتەوە . لە هەندێك ساتدا ، كاتێك هەستی دەكرد پێویستی پێیەتی ، و دەیویست ئامادەی بكات ( وەك چۆن رۆح ئامادە دەكریت ) ئامادە نەدەكرا ، و لە دووری دەمایەوە ، و وەك رۆحیكی یاخی بەسەر سەریەوە دەمایەوە ، و هەرگیز لە جەستەیدا جیگیر نەدەبوو ، هیشتا هاوارەكەی فەوزییەی خوشكی لە گوێیدا دەزرنگیتەوە ، و لەژێردا گۆماویك لە خوێنی گەش كۆبۆتەوە ، و هەموو ڕۆژێك چاوەروانی سەرەی خۆی بوو ، دەرگاكە دەكرایەوە و دایكی محمد بە گویزانیكی تیژەوە دەهاتە ژوورەوە تا ئەو شتە بچكۆلانەیە ببرِیت لە نیوان رانەكانیدا . بەڵام دایكی محمد مردووە و باوكی گویزاویەتیەوە بۆ قاهیرە و ئەو شتە بچكۆلانەیە هەر لە جەستەیدا ماوە .

هەندێک جار لێی دەترسا ، و هەستی دەکرد کە مەترسی هەیە لە جەستەیدا و هەڵەیە . و خوازیار بوو کە دایکی محمد لە گۆڕەکەی بە گویزانەکەیەوە بیتە دەرەوە ، بەڵام دیمەنی فەوزییەی خوشکی هەر لەپێش چاویتی ، کە بە شەلە شەل و گریانەوە بەرەو تەوالیتەکە دەڕۆیشت ، کاتێکیش برینەکە ساریژبوو وەك جاران راینەدەکرد ، و هەنگاوەکانی خاو ببووەوە ، و کە دەڕۆیشت قاچەکانی جووت دەکرد و لیکی جیا نەدەکردەوە.

وایلیهات قینی لەو ڕۆژە بوو کە خۆی تیادا دەشۆری ، هەر کە جلوبەرگەکەی دادەنا و کۆئەندامەکانی ئەبینی هیندەیتر رق ئەستور دەبوو ، بەڵکو قینی لە خوا بوو لەبەرئەوەی دروستی کردووە ، و جارێکیان لە باوکیەوە بیستبووی کە خوا جەستە و کۆئەندامەکانی دروسکردووین . ڕۆژێکیان بە دایکی وت کە قینی لە خوایە و دایکی توڕە بوو و کیشای بە دەستیدا و وتی : چۆن وا دەڵییت ؟.

بە گریانەوە وەڵامیدایەوە و وتی : لەبەرئەوەی شتی خراپ دروست دەکات.

جارێکی تر لێی دەداتەوە و پێی ئەڵیت : خوا تەنها شتی جوان دروست دەکات .

فرمێسکەکانی سڕی و وتی : ئەی باشە کی ئەو کۆئەندامە خراپانە دروست دەکات ؟!

بە دوو چاوی مۆڕەوە دایکی سەیری دەکات و وەڵامی ناداتەوە ، ئەو شەوە گوێی لی بوو دایکی بەگوێی باوکیدا چرپاندی و وتی : ئەم کچە ئاسایی نیە !

ئەو کات نەیدەزانی ئاسایی مانای چیە ، و وا هات بە خەیاڵیدا کە حەزی سیکسی ئاسایی نیە ، هربۆیە کاتێک کە کۆئەندامی پیاوانی بەدیدەکرد بەرز و دیاربوو لە پانتۆڵەکانیانەوە لای ناشرین و قیزەون بوو ، و حەزی بە رشانەوە دەکرد کاتێک بە پیوە لە شەمەندەفەردا دەست و مەچەك و ئانیشکی پیاو بەر سنگی بکەوتایە .

قینی لێیان بوو ، قینی لە پانتۆڵەکانیشیان بوو ، و کۆئەندامە بەرزە دیارە ناشرینەکانیشیان ، و چاوە نیشتووە برسیەکانیان ، بۆنیان کە بریتیە لە بۆنی پیاز و توتن ، و سمیڵە چڕەکانیان کە ئەڵیی میروی مردارەوەبووە بەسەر لیویانەوە .

دەیزانی باوکی پیاوە و قینی دوو هیندەبوو لێی ، کاتێکیش کە شەوان پرخەی نەدەما وا هەستی دەکرد مردووە ، ودایکیشی خۆشنەدەویست ، قینی لە ئافرەتان

و ئـیخە کـراوەکەی سەرسـنگیان بـوو ، کە دوو مەمکـی هەڵئاوسـاوی حەز خەفەکـراوی لیـوە دەردەکەوت ، و چـاوە پـڕ لە کلەکانیـان ، و بەڵام قـاچە ئەسـتورە پیکەوە لکاوەکانیـان و چـاوە نیشـتوو و شـکاوەکانیان سـاردی سیکسـی هەتایی دەردەخستن .
لەگەڵ ئەوەشدا پێیان دەوت هەرزە ، کـاتێکیش کە لە تـارمەکەدا خۆی دەدایە بەر تیشکی خۆر دەیبینی باوکی سەرنجی ماڵە دراوسیکەیان دەدات ، کـاتێکیش کە دوا دەکەویت ، یـان داڵـغەی لیدەدا ، یـان وینـەی دەکیشـا ، یـا خـۆی دەشـۆری ، یـان سەیری ئاوینەی دەکرد ، هۆکارەکان یەکن ، کە پیاوە . دواتر بۆی دەرکەوت کە مێشکی دایکان و باوکان تەنها بە سیکسەوە سەرقاڵە هەربۆیە ئەو تێڕوانینەیان بۆ کوڕ و کچەکانیان هەیە .
لە ئـاهەنگیکی خیزانـی گەورەدا دەنگەکـان تیایـدا بەرز بـوون ، و جەسـتەی سـەماکەرەکان دەلەریەوە ، و چـاوە پڕ شـەهوەت و حەزەکـانی پیـاوان بـریقەی دەهـات ، و ورگەکـان پـڕ بوبـوون لە خـواردن و خـواردنەوە ، فرۆشـتیان بە یەکێـک لە پیاوەکـان بەرامـبەر سـی سـەد جونەیـە . لەنیـوان گـوڵ و تیشـکی گڵۆپەکانـدا دەم و چـاوی سپی هەڵگەڕابـوو ڕەنگـی پـی نەمـابوو ، و دایکـی بە دەنگێکی پچڕپچڕ هەلهەلەی دەکیشـا . و باوکیشـی بە قـاتە نویکەیەوە دەهـاتو دەچـوو و ناوبەنـاو دەسـتیکی دەبـرد بـۆ گیرفـانەکەی نـاوەوە ، کە جـزدانە هەڵئاوسـاوەکەی بە مـارەییەکەی تیـادا نوسـتووە ، منـداڵانیش رادەکەن و یـاری دەکەن بەڵام چاویـان هەر لەسـەر بـوکییە و لە ژیـرەوە دەسـت دەبەن بـۆ کۆئەنـدامەکانیان بە ترسیکەوە ، پیـاوانیش بە قـاچە خواروخیچەکانیـانەوە دیـن و دەچن لە داڵغەی نێرینەییەکی بەسەرچووی فشەڵدان ، و ئافرەتـانیش بە جلوبەرگە بریسکەکانیانەوە چاویـان تارمـاییەکی ئـاهەنگە بە ئازارەکـانی سـەردەمی خۆیـانی گرتووە .
کراسە حەریریە سپیەکە ، تەنـگە لە نـاوچەی سنگەکەی مەمکەکانی خنکانـدووە ، و شـۆڕبـۆتەوە لە رانەکانـدا چەنـد قەدیـك هـاتۆتەوە وەك کفـن ، و کلکیکـی درێژیشـی بەدوای خۆیـدا ڕادەکێشـێت ، و قاچەکـانی بە پـێڵاوە بەرزەکـانەوە تیـدەگیریت ، و بەرەو شـوینی دانیشـتی بـوکینی دەچیـت ، کە بە چەنـدین چەپکـی

گوڵوگـوڵزار رازینـراوەتەوە وەك گـۆرِی سـەربازی ون ، و دەنگـی لیـدانی تەپڵەكـان لە گوێیـدا هیـواش و نـەرمە وەك دەنگـی تەپڵـی بەرِیكردنـی تەرم ، و دەستە بچكۆلانە ساردەكەی لە دەستی گەورەی زاوادایە ، و پەنـجە گەورەكـانی وەك پەنـجەی قەدەر لە پەنجەكـانیەوە ئـاڵاون ، و قاچەكـانی لەژێـر ئەو هەمـوو پێچـانەوەیەوە هیـواش هیـواش دەجوڵێـت وەك ئەوەی بەرەو نەهـامەتیەكی نادیـار برِوات ، و چاوە ڕەشـەكانی هەڵبرِیوە بۆ ئاسمان بێئەوەی سەیری شوینیكی دیاریكراو بكات .

وەك زنجیەكی بەهیز بیستی سـەرجەم دەرگاكـان داخـران ، و دەنگەكـان نەمـان ، وینەكـان ، خـۆی بینیـەوە لە ئوتـومبیلیكی وەك ئوتومبیلەكـانی پۆلیسدا دانیشتووە ، لەلای چەپی پیاویك ( باوكی ) و لەلای ڕاستیشی پیاویك ( زاوا ) ، و روویان بـۆ پێشەوە و بەتیلەی چاو سەرنجی دەدەن وەك سەرنجی چاوی پیاوانی پۆلیس .

لە نزیكـی دەرگـای شـوقەكە زاوا دیـاریەكەی لە بـاوك وەرگـرت ، و لەویـوە خاوەنداریتی بهیە شاهین لە محمد شاهینەوە گواسترایەوە بۆ محمد یاسین . بەڵام هیچكام لەو دوو پیـاوە ئەوەیـان بـۆ ئاشكرا نەبووبوو كە ئەو بهیە شـاهین نـیە ، و ناشتوانریت ببیتە بهیە یاسین .

تەنـها خـۆی دەیزانـی ، و كاتێـك دەرگایـان لەسـەر داخـرا و سـەری هەڵبـرِی و چاوە ڕەشەكانی برِییە ئەو كەسەی لەبەردەمیدا دانیشتووە ، بینـی سمیڵیكی ڕەش خاڵایكی سپی تێدایە وەك نیشـانەیەك ، و موویەكی چرِ بەسـەر سنگیەوەیەتی و چەند دڵۆپە عەرەقیكی پیوەیە ، و دارستانیك موو لەخـوار ورگیەوەیە ، و ئەو خـۆ هەڵدانەسـەر سیسـەمە كە لە خۆهەڵـدانی مەیمـونی دەكـرد ، و بە دەنگێكـی بەرز پیكەنـــی ، و چاوەكـــانی لەسەرســورِماویـدا گەشـــایەوە . بە هیواشـــی بەرە و كانتۆری جلوبەرگەكان چوو و ئەویش سەریسورِما . جلوبەرگەكانی نوستن كە پـێش و دوای رووت بـوون ، و جلەكـانی ژێـرەوە لە پەرِ و دانتـیلا و ئـۆیە ، و شوشـە بۆنەكـان ، و قتـوە بۆدرەكـان ، سـپی ، سـەوز ، سـور ، و فلچەكـانی برژانگەكان ، و پاپوجە پاژنە بەرزەكـان كە گوڵیكی سووری بەسـەرەوە بوو ، و خاولی حەمام ، و سابوونی بۆنخۆش ، و دەرمـانی موو لیكـردنەوە ، و بۆنبرِی جەستەو ، و زەیتەكانی نەرمكردن و شیلان .

کەلوپەلی ژنانەی لە ژیانی هاوسەریتیدا . هەمووی کەلوپەلی سیکسین . کچ لە ماڵی باوکیەوە دەگویزریتەوە بۆ ماڵی میردی و بە قودرەتی قادر دەگۆرِێت لە بونەوەریکی نا سیکسیەوە ( بەبی کۆئەندامە سیکسیەکان ) بۆ بونەوەریکی سیکسی و خەو و خواردن و هەستان و دانیشتنی ئەبیت بە سیکس .

بی ئاگایانە وا هەست دەکەن کە ئەو بەشەی بە گویزان لیکراوەتەوە دەگەرِێتەوە ، یان ئەو حەزەی کە سەربرِاوە و مردووە و تیر بووە لە مردن ئەتوانیت هەستیت .

خەندەیەکی بۆخۆی کرد ، زانی کە کچی پاکیزەی نەزان قەدەغە دەکریت لە پیاو . و ئەو هەلەی قۆستەوە و بە رووتی بە بەردەمیدا دەهات و دەچوو و پیاویتی خۆیی نمایش دەکرد . جارێکی تر پیکەنی ، و وەك نێرینەیەك توڕەیی دایگرت ، وەك ئاژەڵیکی درِندە کەوتە جەستەی . لەقەیەکی لیدا کەوتە سەر زەویەکە ، و چاوی زەق بوو و سەریسورِما و برِوای نەدەکرد . کە ئەو قاچە بەهیزە قاچی مێینەیەك بیت . قاچی مێینە وەك چۆن لەگەڵ لەشفرۆشەکاندا بووە و بینیویەتی ( نەرم و بچکۆلانەیە ) ، و ئەتوانیت بە تەنها دەستیك بینوشتینیتەوە . بەڵام ئەم قاچە رەق و توندە وەك بۆمبا .

بەخۆیی وت هاوسەر وەك لەشفرۆش نیە ، و زانی کە کچی پاکیزە هیندەی نەزانە بەرامبەر پیاو هیندە پتەوە . ئەوەندەی تر حەزی بۆی زیادی کردوو وایزانی یەکەمین داگیرکەرە ، هەستی کرد وەك پێویست لی نە نەویوە دوبارە هەڵکوتایەوە سەری درِندانە تر ، ئەمجارەش بەهیزتر لەقەیدا .

بە عەقڵیکی هاوسەرانەی لەسەرخۆوە تێگەیشت کە رەتیدەکاتەوە ، چاوەکانی بە ترسیکەوە کرانەوە و بە دەنگێکی بەرزەوە وتی :

- چۆن رەتم دەکەیتەوە ؟

بە دەنگێکی توڕەوە وتی :

- من لەشفرۆش نیم .

بە دەنگێکی وەك خاوەنی بیت وتی :

- تۆ ژنمی .

بەسەرسورِمانیکەوە پێی وت :

- کێ ئەوەی پێوتوی ؟
- باوکت و من و مەلا .
- سەخیفترین ریککەوتن لە مێژوودا !.

زڵەیەکی لیدا ، پێکەنی . هەستیکرد کە خەڵکی تووڕە و نیگەران دەبن کاتێک عەیبەکانیان ئاشکرا بکەیت . رووت بوو . کۆئەندامەکەی ڕەشیکی ناشرین بوو ، و بە چاویکی قیزەونەوە لێی ورد بوەوە .

بەشی خوارەوەی لەژێر چەرچەفەکەدا لە شەرمان شاردەوە ، وەك شەرمی هەر پاکیزەیەك لە شەوی هەنگوینیدا ( بەهۆی لەدەستدانی متمانە بە خود ) ، بەڵام بیری کەوتەوە کە پیاوە ، و پیاو شەرم ناکات ، و چەرچەفەکەی لەسەر لاداو سەیری کرد ، و چاوە ڕەشەکانی نەجوڵا .

لە تووڕەییدا وتی :

- تۆ مێینە نیت .

تۆمەتبارکردنی تەقلیدی ، کە پیاو بەدەم و چاوی ئافرەتیدا دەدا ، هەست دەکات کە زەوی لەژێریدا دەلەرزیت ، و هیچ شتێکی لا نامینیت . ئەی بەرای ئەوان ئافرەت چی بۆ دەمینیتەوە گەر کۆئەندامی پیاوی بەلاوە پیرۆز نەبیت ؟

- کێ بەتۆی وتووە من مێینەم ؟

بە تووڕەییەوە وتی

- کەواتە باوکت دەستی برِیم .

پێکەنی :

- پێویستە نرخەکەی لی وەرگریتەوە .

وتی :

- ئەو دەستبرِە !

وتی :

- پێویست بوو مانگاکە جوان سەیر بکەیت پێش کرِینی !

وەك کەسێک بەدوای بیئابرِویدا بگەرِیت ، و تەنها بیئابرِوی فریای دەکەویت ، و هەر ئەوە وا دەکات هەمووان بیڵینەوە ، و ئەویش دەیەوێت بیڵیتەوە ، بی باوك و بی دایك و بی خیزان بیت سیبری بیت یا بیپاریزیت . بەڵکو

پاریزگاری خودی خۆی مەترسیە . بریتیە لە دەستدرێژیكردنە سەر ڕاستیەكانی ، و دەستدرێژیكردن بۆسەر ویست و بوونی .
بە دانیشتوویی لەسەر جیگاكەی مایەوە ، و بینی سەرچەفەكەیدا بە سەر خۆیداو نوست ، و پاش كەمێك پرخەی لی بەرز بوەوە ، و زانی كە پرخەی میردەكان وەك پرخەی باوكان وایە ، و لەسەر نوكی پەنجەكانی خۆی دزیەوە و چووە دەرەوە ، و كاتێك تاَڵە سورەكانی بەرەبەیانی لە ئاسۆوە بینی ، تێگەیشت كە ئەم بەیانیە ، یەكەمین بەیانی بوكینیەتی و ئابڕوچوون چاوەڕوانی خیزانەكەیەتی ، باوكی دیت تا بۆنی خوێن بكات ، و دایكی بەرگی ناوجیگاكە و جلی خەوەكەی ئەپشكنیت ، و ئەندامانی خیزانەكەی بە ناو ماڵەكەدا بڵاودەبنەوە و بیهودە بەشوین شەرەفی نادیاریاندا دەگەڕین .
بە دوو پێی جیگیر و قورسەوە بە شەقامەكەدا دەڕۆیشت ، و بلوسە سپیەكە و پانتۆڵە ڕەشەكەی لەبەردابوو ، و بەهەموو توانای لەزەوی دەدات و قاچەكانی بە متمانەوە لیك جیادەكاتەوە ، و هەنگاوەكانی فراوان و خێرابوون وەك هەنگاوی گەنجیكی وەرزشەوان ، پێڵاوەكانی فلات بوون بی پاژنە ، قژە كورتەكەی پەخشان ببوو بەسەر شان و ملیدا لە دواوە ، و چاوە ڕەشەكانی بڕیبووە ئاسمان بۆ پێشەوە ، لیوەكانی لە سوور بوون و رقدا جووت ببوون . كاتێك گەیشتە شەقامی قصر العینی زانی ئامانجی كوییە .
بینی یەكێك لە هاوڕیكانی لە شەمەندەفەرەكە دادەبەزیت گەڕایەوە دواوە و لە پشت دیواریكەوە خۆی شاردەوە ، گروپ و كۆمەڵی خوێندكارانی بینی كە لە شەمەندەفەر یان پاسەكان دادەبەزن و بەرەو كۆلیج دەڕۆن . دوای ئەوەی هێمنی باڵی كیشا بەسەر شەقامەكەدا و سەرجەم خوێندكاران چوونە ژوورەوە ، لەپشت دیوارەكەوە هاتە دەرەوە و بە پاڵ دیواری دەرەوەی كۆلیجدا رۆیشت ، لەودیوی شیشەكانەوە سەیری دەرگای هۆڵی توێكاری دەكرد ، و دەرگاكەی بەرامبەری هەر لافیتە سپیەكەی پیوەیە و ناوەكەیی لەسەرە ، و سەری خوێندكارەكان لەودیوی پەنجەرەكەوە دیارە دەجوڵین لە ناوەوە .
بهیە شاهین !

گـوێی لەو دەنــگە زرنگـایەوە لەپشـتیەوە و راچڵەكــی . روخســاری یەكێــك لە هـاورێیكـانی لەبەردەمیدا بینــی . نـاوەكەیی بەبیرهـاتەوە . نـاوی رەئـوف قەدری بوو .
لێی پرسی : - دەنگوباسی كۆلیج چیە ؟
وتـی : - لە كۆلیج نەماوم .
پرسی : - تۆشیان دەركرد ؟
پرسی : - بۆچی كەس دەكراوە ؟
وتـی : - چوار دەركراون و من پینجەمینیانم .
وتـی : - منیش دەركراوم ، بەڵام بە دەسەڵاتیكی تر .
پیكەنی : - دەسەڵاتەكان زۆربوون و دەركردنیش یەكە .
پرسی : - ئەی دكتۆر فوزی ؟
وتـی : - وەك خۆیەتی لە نەخۆشخانەكە .
و ماوەی نیوانی هەردوو نەخۆشخانە كۆنەكە و نویكەی برێی ، لە خوارەوە لە ئاوەكەدا بەلەمەكەی بینی كورێوكچیكی تیدابوو سەولیان لیدەداو دەستیان بەرز كردبـووەوە بـۆ ئافرەتیـك لە تــارمەكەدا وەسـتابوو ، ئوتــومبیلیكی درێــژ بەلایــدا تیپەرێی وەك ئوتومبیلی پۆلیس وابوو ، و ئوتومبیلیكی ئەمبولاس / فریاكەوتنی بەدواوە بــوو ، و بەدەنگـــی لـــورە بەهیـــزەكەی قەرەبـــاڵخی بەردەم دەرگـــای نەخۆشـخانەكەی بـڵاوە پیكـرد ، و پیـاوانی ڕەنــگ پینەمـاو ریزیـان بەستبوو ، و ئافرەتـانیش بە جلـوبەرگی ڕەشــەوە ، و منــداڵانیك بە چــاوە نیشــتوەكانیانەوە ، و پرتەقـاڵ فرۆشـەكان بە ئوتومبیـل و عەرەبانەكانیـانەوە ن و سـەگ و پشـیلەكانیش لیرە و لەوی لە خۆڵەكاندا ئەگەرێین .
چــووە حەوشـــەی نەخۆشـــخانە نـــوییە فــراوانەكەوە ، و ئوتـــومبیلی پزیشـــك و مامۆستاكان بەریز وەستابوون ، وەك وەستانی پاپۆرێەكان لە بەندەرەكاندا ، یان فرۆكەكانی سەر زەوی فرۆكەخانە ، پشتە چەماوەكەی لەژیر تیشكی خۆرەكەدا وەك پـۆڵا وابـوو ، دواوەشــی درێـژ و نەرم وەك كلكـی مـار ، و بە هیزیكـی زۆر پێـی لە زەوی نـا وەك ئەوەی پـی لە هەمـوو كلـكە نەرمەكـان بنــی ، و سـەرجەم مامۆستاو پزیشكەكانیش بە ئوتومبیلە درێژە كەشـخەكانیانەوە ، و ورگە زلـەكانیـان

كە بۆ پێشەوەیە ، و كورسیە چەرمەكانیان و ناوە هەڵواسراوەكانیان لە شەقام و گۆرِەپانەكاندا ، و برِوانامەكانیان كە بە بزمار بە پشتیاندا هەڵیانواسیوە ، و بۆن و بەرامی خوێن و عەرەق لەو پارانە دیت كە گیرفانیانی هەڵئاوساندووە .
بەرەو كلینكەكە چوو ، و سەری دكتۆر فوزی بینی لە نیو ریزی لاشە سستەكانەوە كە وەك پەیكەر وابوون ، سەرەكان بەزۆر لەسەر جەستەكان راگیرابوون ، و بە ناچاری و بە زەحمەت قاچە خواروخیچەكان ڕاستكراونەتەوە ، و چاوەكانیش لاواز و نیشتوو ، و دەمەكان كراونەتەوە و هەناسە برِكییانە ، و بۆگەنی جەستەی مردوویان لیدیت .
ریزبەندی جەستەكانی برِی تا بگاتە دكتۆر فوزی بەڵام بێئەوەی خۆی بدات لە هیچ جەستەیەك ، بۆئەوەی نەلەریتەوە و خۆی بە دیواریكەوە بگریتەوە ، یان بكەویت بەسەر جەستەیەكی تردا ، و بە ئاستەم چاوە زەردەكان لێی دەرِوانن ، و لێی ورد دەبنەوە وەك ئەوەی لە پشتی هەوریكەوە یان لە جیهانیكی ترەوە هاتبیت ، بە ئاستەمیش هەست دەكەن كە لە ریزدا وەستاون .
بینی دكتۆر فوزی لەوسەری ریزەكەوە دانیشتووە ، و بیستەر / سماعە كانزاییەكە وەك پەتی سیدارە لە ملیدایە ، و قەڵەمەكە بە دەستیەوە لەسەر كاغەزە سپیەكە دیت و دەچیت بە نوسینی گیراوە و تیكەڵەكان لە ( سۆدا و ئاسن و زەرنیخ ) ، و عەرەقیكی زۆریش لە نیوچەوانیەوە دەهاتە خوارەوە ، و بە ئاستەم دەنگی لە نیوانی هەناسەبرِكی و كۆكەكانەوە دیت و ئەبیستریت ، هەناسە هەڵمژە ! بیگرە ! بڵی ئـــا ! بڵی یەك دوو سی چوار ! دەست درێژكە ! قاچ درێژكە ! خۆت گورجكەرەوە !.
دكتۆر فوزی بینی وەستاوە لە جیگەكەی هەستاو بە خەندەیەكەوە بەرەوپیری چوو :

- بەخیربیی بهیە ... ویستم پەیوەندیت پیوە بكەم تا هەواڵت بپرسم بەڵام ناونیشانتم نەدەزانی . تۆ باشیت ؟

بە دەنگێكی هێمن وتی : نەخێر .
چاوەكانیان كەمێک بەبێدەنگی بەرامبەر یەك مایەوە .
پاشان لێی پرسی : - دەنگوباسی سلیم چیە ؟

وتی : - گواستویانەتەوە لە بەندیخانەی میسرەوە بۆ بەندیخانەی تەرِە .
پرسی : - ئەی سەردان ؟
وتی : - قەدەغەیە تەنانەت بۆ دایکیشی .
وتی : - بیستوومە هەندێک لە خوێندکارەکانیان ئازادکردووە .
وتی : - لەوانیەو لەو جۆرەی وەك سلیمن وازوو ئازاد ناکرین .
پرسی : - ئەی کەی ئازاد دەکرین ؟
وتی : - کەس نازانیت ، و لەوانەیە چەند ساڵیك بخایەنیت .
هاواریکرد : - چەند ساڵیك ؟!
بە دەنگێکی پرِ پەژارەوە وتی : - ساڵانیکی زۆریش کەس ماوەکەی نازانیت .
بە دەست و پەنجەیەکی لەرزۆکەوە تەوقەی لەگەڵ کردوو رایکردە شەقامەکە . بینی خەڵکی ئەرِۆن بۆسەر کارەکانیان یان بۆ ماڵەوە ، وەك هەر رۆژێکی ئاسایی و وەك ئەوەی هیچ رووی نەدابیت ، وەك ئەوەی شتێکی ترسناك رووی نەدابیت ، ترسناکترین شتێک کە روبدات و روویدا ، و کەسیش نازانیت ، و کەسیش گوێنەداتی ، و وەك ون بویەك بە شەقامەکەدا دەرِۆیشت ، و کاتێک گەیشتە نزیك دیواری کۆلیج لە پەنجەرەکانەوە سەری خوێندکارەکانی بینی لە هاتن و چوندا بوون بەسەر لاشەکانەوە . وەك چۆن دەیبینین لە هەر رۆژێکی ئاساییدا ، وەك ئەوەی هیچ رووی نەدابیت . و لە داخان دانە جیرِەیەکی کرد ، و پێیەکی پتەویدا بە زەویدا ، ژیانی ئاسایی چەند ناشرینە لە دوای رووداویکی گەورەوە ، چەند قیزەونە ژیانی بی واتا ، و ئاسمان بە هڵواسراوی ماوەتەوە ، و زەویش بە راخراوی ، و هەورەکانیش لە جوڵەی ئاسایی خۆیاندان ، و خەڵکی بەسەر شەقامەکاندا رۆیشتنی ئاسایی بی واتا دەرِۆن . ئەم خۆهەڵخەڵەتاندنە بۆ دوایی نایەت ؟ جارێکی تر پێی دایەوە بە زەویدا . بۆچی ئەم جوڵە بی واتایە لە سورِان ناکەویت ؟ بۆچی خەڵکی تەنها ساتیك ناوەستن ؟ و سەریان بەرز بکەنەوە و ئەو زنجیرە ئاسنینانە بەدی بکەن کە لە ملیانەوە ئاڵاوە ؟
بهیە !

گوێی لەو دەنگە بوو لە پشتیەوە راچڵەکی . دەم و چاویکی بینی لە ئوتومبیلیکی ڕەشی درێژەوە هاتۆتە دەرەوە وەك ئوتومبیلی پۆلیس . دەستبەجی بیری کەوتەوە . دکتۆر علویە . خێرا دابەزی و چووە لای . بە پەرۆشیەوە لێی پرسی :

بهیە ! تۆ ئەم هەموو ماوەیە لەکوی بویت ؟

بێدەنگ بوو و وەڵامی بۆ نەدرایەوە . دەستی راکیشا بەرە و ئوتومبیلەکە :

- لەگەڵم وەرە . ئەمەویت قسەت لەگەڵدا بکەم .

کات نیوەرۆ بوو و تیشکی خۆر گەرم هەستی پیدەکرد گەرم بوو لە پەنجەرەی ئوتومبیلەکەوە لە قۆڵی دەدا ، و بەخۆی وت : ( ساڵانیکی زۆر کەس ماوەکەی نازانیت ) . و چاوەکانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و ونبوون و یاخیتیەکی بی سنوری تیدابوو . ئەم زەمەنەنا دەستنیشانکراوە ، نەناسراوە ، وەك تەمەنمان ، کاتێک نازانین لە چ ڕۆژێکدا دەمرین ، و زۆر گیلانە وا هەست دەکەین کە هەرگیز ئەو ڕۆژە نایەت ، یان گیلانە تر هەست دەکەین کە لە هەر ساتیك و لە هەر کاتێکدا دیت ، ئەم نەهامەتیە نادیارە ، نا بیکۆتاییە ، تیایدا ئەژین ، و لەسەر جەستەکانمان وەك باریکی قورس بۆ هەتایی هەڵیدەگرین .

گەر پێی بوتایە ئەو لە دوای پینج ساڵ یا دە ساڵ یان بیست ساڵی تر ئازاد دەکریت لەوانە بوو نەهامەتی هیور تر بوایە . لەوانە بوو بەرگەی بگرتایە ، چاوەڕوانی ئاسانە گەر کات دەستنیشانکراوبیت ، و کۆتاییەکەی دەزانین ، و ئەتوانین بە نوکی قەڵەم دیاری بکەین . بەڵام لە نیوانی دوو هیڵی بەرامبەردا بژین کە هەرگیز بەیەك نەگەن ، و لەنیوانی دوو دەمدا بین نەزانین کەی جووت دەبیت ، ئائەمەیە نەهامەتیمان ، و نهێنی ماتەمینی قوڵ لەخۆشیەکانماندا ، و نهێنی شادمانی بی واتا لە پەژارەکاندا ، ئەزانین کە خۆمان هەڵدەخەڵەتینین ، ئیمە لە نیوان گیرەی ویستیکی دوور لە دەسەڵاتی خۆماندابن ، بیگومان پیوەمان دەدات لە ساتوەختیکدا کە نازانین کەیە .

کاتێک ئوتومبیلەکە بەخێرایی دەرۆیشت هەستی دەکرد کە لە چنگی قەدەردایە ، و لادانیکی ئوتومبیلەکە دەیکاتە لاشەیەکی شیلراو . لایکردەوە بینی لە چنگی قەدەردا نییە ، بەڵکو لە چنگی ئەو دوو دەستە گەورەیەدایە کە سوکانەکەی

گرتــووە . و تەنهــا جــوڵەیەكی ئەو دوو دەســتە بەســە بــۆئەوەی ئەویــش و ئوتومبیلەكەش لەناو بچن .
هەستیكی بی واتا دایگرت . لە ناكاو ئوتومبیلەكە خەریكبوو خۆی بكیشیت بە ئوتــومبیلیكی تــردا . بــی واتــای ڕاســتەقینە ئەوەیە كە مــرۆڤ هەســت بە بــی دەســەڵاتی ژیانی بكات ، و بی واتایی كاتی مردنــی نەزانــراوی ، و بــی واتــایی بەستنەوەی بە زنجیری ئاسنین تا كاتێكی نادیار .
بی واتایی ڕاستەقینەی ئەوەیە كاتێـك مرۆڤ دڵنیابیت لە مردنــی لەهەر ساتیكدا كەواتە بۆچی ئەم ساتە نەبیت ؟
گوێی لیبوو دكتۆر علوی وتی :
- ئەمەویت ئەم نیوەرِۆیە لەگەڵ تۆدا نان بخۆم ، ئایا قایل دەبیت ؟
ئەم پرسیارەی زۆر بە هێمنــی و ئەدەبەوە لیكــرد زۆری بەلاوە سـەیر بــوو . گەر لەو ساتەدا پی بوتایە : ( دەمەویت بتخەمە قولایی نیلەوە قایل دەبیت ؟ پێـی دەوت قــایلم ) بەڵام ئەو بۆنــانی نیــوەرِۆ داوەتــی دەكــات . داوەت كردنــی بــۆ نــانی نیــوەرِۆی وەك داوەت كــردن بــۆ مــردن وابــوو بەلایەوە بــۆیە بە دەنگێكــی ئاساییەوە وتی :
- قایلم .
بە خێرایی بە ئوتومبیلەكە بە ڕێگایەكی درەختاویدا رۆیشت . ئەو تەنها كەمێـك لە جیگاكــانی قــاهیرە شــارەزابوو ، هەســتیكرد كە لە جیگــایەكە پێشــتر نەیبینیــوە . بەڵام نەیپرسی . و بەبی دەنگی مایەوە ، خۆی دابوە ئەو هەستكردنە خۆشــە بەبــی واتایی ، گوێی لیبوو ئەڵی :
- بۆچی كۆلیجت جیهیشت ؟
بە دەنگێكی گاڵتەجارِیانەوە وەڵامیدایەوە :
- بەشویاندام .
پیكەنی و دەستی درێژكرد و دەستی گرت :
- ئەمە نوكتەیە ؟
وتی : نوكتە نیە و ئەمە ڕاستیە .
چاوەكانی گەشانەوەیەكی دروستكراوی تیادا رووداو وتی :
- ئەی چیت لیكرد ؟

بەبی دەنگی وتی : - رامكرد .
جارێكی تر پیكەنی :
- لە دادگا بە تاوانی جیهیشتنی ماڵ دەتبەنەوە .
پیكەنی و لایكردەوە بەلای خۆرەكەدا . بینی چاوە ڕەشەكانی ئەرِوانیتە بەرزی ، و لیوەكانی جووتبوە . لێی پرسی :
- چۆن دەژیت ؟
قژە پەخشانەكەی راوەشاندوو وتی :
- ئیش ئەكەم و ئەژیم .
وتی : ئەوان لە هەموو جیگایەك بۆت دەگەرِین .
بە متمانەوە وتی : نامدۆزنەوە .
وتی : خۆشاردنەوە لە شاریكی وەك قاهیرە قورسە ، و پاشان چاوەكانیان زۆرن و هەموو دەسەڵاتەكانیش لە دژتن .
بە تیلەی چاویكی وریاوە سەرنجیكی شەقامەكەیدا ، و لایكردەوە بەلایدا بەدوو چاوی پشكنەرەوە وتی :
- تۆش هەروەها لە دژمی ، وانیە ؟
پیكەنی و وتی : - لەوانەبوو لە دژت بم ، بەڵام من خۆشمئەوییت .
ئەو وشەیە لە گویچكەیدا زرنگایەوە و سەیربوو ( خۆشمئەوییت ) لیوەكانی كرانەوە تا بپرسن : ( مەبەستت چیە ؟ ) بەڵام نەی پرسی و لیوەكانی جووت بونەوە و بێدەنگ بوو . ئوتومبیلەكە لەبەردەم خانویەكی بچكۆلانەدا وەستا دەوروبەری دارودرەخت بوو . كلیلەكەی لە گیرفانی دەرهێناو دەرگاكەی كردەوە . خۆی لە هۆڵیكی گەورەدا بینیەوە دیوارەكانی بە كاغەزی ڕەنگاوڕەنگ نەخشینراوە ، و پەردەكان پەمەیین ، و ئاگردانەكەش پەیكەری ئافرەتیكی ڕەشپێستی رووتی لەسەرە . لایكردەوە بەلایدا بە سەرسورِمانیكەوە . و پیكەنی و وتی :
- بە درێژایی ڕۆژ لە كۆلیج و كلینك و نەخۆشخانە هیلاك دەبم لە پیناو بەسەر بردنی چەند ساتیكی خۆش لەم شوینە نهێنیەمدا .
چاكەتەكەی بەری دانا و بۆن و بەرامی پارەی كاغەزی گیرفانەكەی ناوەوە ، وەك بۆنی نەخۆشخانە : تیكەڵەیەك لە خوێن و عەرەق و هەناسە

پچڕپچڕەكانی نەخۆشەكان . لایكردەوە ، بینی پەرداخیكی دایە دەست و وتی :

- ئەمە خواردنەوەیەكی میسریە پێی ئەڵێن ( عومەر خیام ) . ئەمە باشترین خواردنەوەیە لە جیهاندا. رات چۆنە ؟
- نازانم ، چونكە من پێشتر نە خواردنەوەی میسری و جگە میسریشم نەخواردۆتەوە .

سەرنجیكی چاوە پڕ خەمباری و پەژارەییەكانیدا و پاشان وتی :

- من لە ژیانـدا فەلسـەفەیەكی تـایبەتم هەیە ، ئەویـش ئەوەیە كە ڕۆژ بە دوای ڕۆژدا بژم ، و بیر لە دوێنێ و بەیانی نەكەمەوە . تۆش پێویستە لەمەودوا وا بكەیت .
- من فەلسەفەیەكی ترم هەیە .

بە دەنگێكی بەرز پیكەنی و وتی :

- ئافرەتی جوان پێویستی بە فەلسەفە نیە .

پینەكەنی . دەستی درێژكرد و دەستی گرت و ماچیكرد :

- بهیە ، من خۆشمئەوییت ، تۆ واتای خۆشەویستی نازانیت ؟
- بەدەنگێكی ئاشكرا وتی : نەخێر .

رایكیشاو نوساندی بەخۆیەوە ، هەستی بەخێرایی لیدانی دڵی كرد ، و بەدەستی ڕاستی هەردوو دەستی گرت ، و بە دەستی چەپێشی دەستیكرد بە كردنەوەی قۆپچەكانی كراسەكەی . بە قاچی پاڵی پیوەنا كەوتە سەر زەویەكە . هەستایەوە و بە سەرسورمانیكەوە لێی ورد بوەوە . سەرسورمانی ئەم زیاتر بوو . لەسەر كورسیەك لە نزیكی ئاگردانەكە دانیشت و سەری شۆركردەوە ماوەیەك و پاشان وتی :

- وادیارە من هەڵەم كرد . واهەستم ئەكرد كە خۆشتئەویم .

بە سەرسورمانیكەوە وەڵامیدایەوە :

- ئەم بۆچونەت لەكویوە هێناوە ؟

بە زمانی مامۆستایانە وتی :

- من لە ئافرەت ئەگەم .

پرسی : - ئەی بە چ عەقڵێك لێی تیدەگەیت ؟
بە پەنجەی دەستی برد بۆ سەری و بە خەندەیەکەوە وتی :
- پیاو یەك عەقڵی هەیە لە سەریدا . ئەوەم لە توێكاری فیرنەکردووی ؟
بە دەنگێكی گاڵتەجاڕیانەوە وەڵامیدایەوە و وتی :
- توێكاری شتێکە و ڕاستیەکان شتێکی ترە .
وتی : - ڕاستی کامەیە ؟
وتی : - عەقڵی پیاو لە سەریدا نیە .
لێی پرسی : - ئەی لەکوییدایە ؟
بە متمانەوە وەڵامیدایەوە : - لە نیوان رانەکانیتی !
چاکەتەکەی لەبەرکردەوە و وتی :
- تۆ کچیکی نا ئاساییت .
بە پێکەنینیکەوە وتی :
- تۆش پیاویکی ئاساییت .

بە شادمانیەکەوە پێی لە زەویدا ( کچیکی نا ئاسایی ) ، ئەی ئەبی کچی ئاسایی لە چاویاندا کی بیت ؟ ئەوەیە کە بە دوو چاوی نیشتوەوە بر ِوانیت ، ئەوەیە کە بە دوو قاچی پیکەوە لکاوەوە بر ِوات ، گویر ِایەڵ و ملکەچ ، کە سەرجەم ناوچە سیکسیەکانی دیار و هەست پێکراوبیت ، نوقم بوو لەنیو بۆدرە و ماکیاجە بۆندارەکان ، شەو و ڕۆژ گویگر و بینەری هات و هاواری گۆرانی و فیلمە سیکسیەکان ، ئەوەی کە بە دزیەوە و لە پشتەوە چەندین لە چیرۆك و رووداوەکانی ئەوین و سۆزداری دەرخە ، کە ناتوانیت تەنها جارێک خۆی لە قەرەی ئەزمونیکی ڕاستەقینە بدات ، پاکیزەی خاوین کە بەردەوام سەرقاڵی قژ راوەشاندن و سەرنج ڕاکێشانی نێرینە بیت .

بە هەنگاوە خێراو فراوانەکانیەوە ئەرۆیشت ، و لە روخساری خەڵکی ورد دەبوەوە بەڕاست و چەپدا . شەقامەکە قەرەباڵخ بوو ، دەم و چاوەکان هەموو لە یەك دەچوون ، جوڵەشیان لیکچووە ، هەروەها دەنگیشیان ، چاوەکانیشیان کاتێک سەیریان دەکەیت نایانبینیت . هەستیکرد لە دەریادا نوقم دەبیت و کەس نایبینیت ، و بێئەوەی کەسێک جیای بکاتەوە ، و روخساری وەك روخساری علیە و زکیە و نجیە و ئیفۆنی لیهاتووە .

بەبــی ئاگــایی بەرەو شــەقامی مــوقەتەم رۆیشــت ، و چاوەکــانی بەســەر زەوی و ئاسمان و درەختەکاندا دەگەرِیت بەشوین ئەو چاوانەی بتوانیت لێیان برِوانیت ، بە شـوین ئەو دەم و چـاوە بـاریکە لاوازەی پـرِە لە هیلاکــی و هەڵگـری خەم وپەژارەکـانی مـرۆڤە ، بە دەنگێکـی بەرز هـاواریکرد ( سـلیم ! ) هـیچ کەسـێک وەڵامــی نەدایەوە ، بەڵام لاینەکـردەوە تـا بـگەرِیتەوە . ئەو دەیزانــی کە بـوونی هەیە و لەویـیە . وەك ئاسـمان و هەواو خـۆر و مانــگ و فەلەك . دیـاردەیەکە لە دیاردەکانی کەون . هەموو کاتێک هەڵیدەمژیت ، و هەست بە بەرکەوتنـی دەکـات لە کاتێکـدا دانیشـتووە یـان نوسـتووە ، و کــاتێکیش ســەرنجی ئاسـمان دەدات لە شینابییەکەیدا چاوەکـانی بەدیدەکات ، و لەهەر بـازنەیەکی تیژدا لوتـی ئەبینیتـەوە ، و لەهەر هەنگــاوێکی بەســەر زەویــدا گــوێی لە تەقەی پێیەتــی . خەریـك بــوو لابکـاتەوە تـا ببیبنێـت ، بەڵام لاینەکـردەوە . دەیزانــی لەوی نـیە ، و ئاسـمانی لــی بەتاڵە ، و زەوی مرۆڤـی تیدا نیە ، و کەون وشکهەڵهاتووە وەك سندوقیکی بەتـاڵ ، و بە ماتۆرِیکی ئەفسانەیی هەرچی هەوایە لێی دەرکراوە .

بهیە ! ئەم دەنــگەی لە پشـتەوە گـوی لـی بـوو راچڵەکـی . کەسـی نەبینـی . خۆی گـورج کـردەوە . لەم جـوڵەیەدا هەسـتیکرد کە ئەچیـت بـۆلای ، و ژیـانی بەخـت ئەکات لەپینـاو چوونـی بۆلای ، و هیچ شتێک نیە بتوانیت بکەویتە نیوانیـان ، نە مردن و نە تەقاندنـی گوللە و نە خوێن بەربوون ، و نە نەشتەریکی تیژ کە گۆشـت ببرِیت ، و نە دەرگای ئاسنینی بەرز و نە قوفڵ .

وەك ئەوەی ئامــانجی بزانیـت بە هەنگــاوە خێـرا و فراوانەکــانی رۆیشــت . بەڵام پاش چەند چرکەیەك وەستا . نەیدەزانی بۆ کوی دەرِوات . و کاتێـک لایکـردەوە سـەری بـاوکی لە پەنجەرەی تەکسیەکەوە بینـی ، و لە تەنیشـتی سـەری مـامی ، و سەریکی سیهەم لە پێشەوە شەوی بوکینی بەبیرهاتەوە . لەپشت دیواریکەوە خۆی حەشاردا و هەناسە برِکیی پی کەوتبوو . و تەکسیەکە لە ئاپۆرِەی قەرەبـاڵخی شەقام و ئوتومبیلەکاندا بە هەرسی سەرەکەوە ون بوو . لە پشتی دیوارەکەوە هاتە دەرەوە و بە هەردوو قــاچە درێــژە پتەوەکــانیەوە بە شــەقامەکەدا هەنگاوینــا ، و دەنگـی هەنگاوەکـانی پێـی لە گوێیدا ئاسایی و دیـارە ، پـی لە دوای پـی ، ململانـی دەکات لەگەڵ زەویدا ، و پێیەکـی بەرز دەکـاتەوە بۆ ئاسمان و دایدەگریت بۆسـەر

زەوی ، وەك ئەوەی زەوی ئەمـدیو و ئەودیـو بکـات ، و بەڕەنگـاری سـەرجەم جیهانی دەوروپشتی دەبیتەوە ، و هەرکەسێک لێی نزیك بیتەوە دەتوانیت بەر پی لەقەی بـدات ، هەرکەس بیەویـت بەری بکەویـت و دەسـتی بۆبەریـت و هەوای دەوروبەری بجوڵێنیت پەنجە دەکات بە چاوەکانیدا ، و هەرکەسێک ڕێگەی پی بگریـك نەشـتەرەکەی لە ورگـی دەدات و دەیکوژیـت . بەڵـی دەیکوژیـت . لەو ساتەدا توانای ئەنجامدانی هەر تـاوانیکی هەبوو ، بەڵکو تەنها تـاوانیکی کوشتن دەیتوانی ئەو ئاگرە هەڵئایساوەی ناخی بکوژێنیتەوە .

کـاتژمیر سیی بەیـانیە ، ئەو کـاتژمیرەی پێش یەکەمـین تـاڵی سـپی دەرکەوتنـی بەرەبەیـان دەکەویـت ، و تـاریکی دەدات بەسـەر کۆلانە تەنـگە قـورِینەکـان ، و خـانووە کـۆنە پـیکەوە نوسـاوەکان وەك جەسـتەی نەخۆشـە لاوازەکـان ، و هەناسەکانی گەرِەکـی ( دەراسـە ) ی قەرەباڵخ لە درزی پەنجەرە تەنگەکانیەوە بۆن و بەرامی خۆڵی چیا و عەرەق و پیاز و ماسی سورەوەکراوی لیدیت ، ئەو گەرەکەی کە لە ڕۆژدا وەك کورەی هەنـگ لە خەویکـی قوڵدایە ، خەوی جەستە لاواز و بی جوڵەکان دیمەنی مردووی هەیە ، و هیچ دەنگێک نیە ئەو سرِی و خاپور بوونەی ببچرِینیت تەنها لـورە و وەرِینـی سـەگ نەبیت ، یـا گریـانی کۆرپەیەکی ساوا ، یان میاواندنی پشیلە .

لەو کاتژمیرەدا جوڵە لەوپەرِیدایە لە ژوورەکانی ژیرخانی خانوە کۆنەکاندا ، و دیشلی چاپخانە بچکۆلانەکە پەستان دەخاتە سەر وشە ڕەشەکان بۆسەر کـاغەزە سـپیەکان ، و کاتێـک لاپەڕەکە پـرِ دەبیـتەوە دشـلیەکان هەڵیـدەگیرِنەوە و کـاغەزیکی نوی رادەکیشن ، و هەرسی دەم و چاوەکە هیلاك و لاوازە ، و هەر شـەش چـاوەکە لەسـەر جـوڵەی بـازنەیی کـاغەزەکەن ، و لەنیوانیانـدا دوو چـاوی ڕەش رووی لە ئاسـمان کـردووە ، و بەرزیەکەی پێشـتر هەسـتی پێکـراوە و ڕەشـاییان زیـاترە ، و لوتیشـی تیـژ و بـۆ پێشـەوەیە وەك ئەوەی کەون بکـاتە دوو بەش ، و لیوەکان لە توڕەیی و سوربوندا جووتن .

بهیە ! دەنـگەکە لە گوێیـدا زرنـگـایەوە ، و لایکـردەوە بینـی رەئـوف کاغەزەکـان دەخـاتە نیـو جانتـا چەرمەکەوە ، و فـوزیش چاپخـانەکە دەخـاتە قـولایی زەوی ژوورەکەوە ، و بەهـۆی تەبەقە تەختەکـانەوە زەویەکە وەك پێشـوی لیـدیتەوە و

دیتەوە یەك . بەبی دەنگ دەرگای ژووره بچكۆلانەكە دەكریتەوە ، و هەرسی جەستەكەی لیوە دیتە دەرەوە ، یەك لە دوای یەك ، و نەدەتوانرا لە نیوانیان بناسریتەوە ، تاریكی دەم و چاوی شاردبوەوە ، و جەستەكان لە تاریكیدا هەموو لە یەك دەچن ، و قاچەكان لەنیو پانتۆڵەكەدا درێژ و ماسولكەكانی پتەوە ، و دەستی ڕاستیش جانتایەكی چەرمی هەڵئاوساوی پیوەیە .

لە گۆڕەپانە بچكۆلانەكەدا رەئوف بەلای ڕاستدا دەڕوات و و لە شەقامە تاریكەكەدا ون دەبیت ، و فوزی بەردەوام دەبیت لە ڕۆیشتن بۆ گوڕەپانە فراوانەكە ، بەڵام بهیە بە هەنگاوە خێراو فراوانەكانی بەرەو پاسیك دەچیت كە لە ویستگەیەك وەستاوە ، سنگی هەڵبەز و دابەزی بوو ، و هەناسەكانی پچڕپچڕ ، و جانتا هەڵئاوساوەكەش لەسەر سنگی بوو ، و بەهەردوو دەستی وەك چۆن منداڵیك لە ئامێزی گرتبوو ، و لە ویستگەیەك هاتە خوارەوە وەك ئەوەی ئامانجی بزانیت ، و بزانیت لە كوی وشە گڕاویەكانی بوەشینیت ، خەڵكینە هەستن لە خەو ، پەنجەرەكان بكەنەوە ، چاوەكانتان بكەنەوە و سەیریكی ئەو زنجیرە ئاسنینانە بكەن كە لە گەردنتانەوە ئاڵاوە و بیربیننەوە بە بەرخۆتان و بزانن كە عەرەقەی نیوچاوانتان دزراوە ، و دەخڵتان دزراوە ، و گۆشتتان خوراوە ، و تەنها ئێسكەكانتان بۆ دەمینیتەوە ، و چەندین پەیكەری بەریز وەستاو ، و یەكە بە یەك خۆی گرتووە ، و هەناسەكان بە كۆكەی پچڕپچڕ هەڵدەمژریت و دەدریتەوە ، و خوێنی سور لە برینیكی كراوەوە لە سنگدا دیتە دەرەوە .

وشە و وتەكان فڕیدەدات بە دەم و چاوەكاندا بە بەتاڵی ، وەك پاسارییەك لە زەویدا بازبازینیتی ، و لەبەر خۆیەوە گۆرانیەكانی منداڵی دەڵێتەوە كە بە شادمانیەكەوە لە قوتابخانە دەگەڕانەوە و جانتا بەتاڵەكانیان هەڵدەسوڕاند ، و هەڵیدەدایە ئاسمان و دەیگرتەوە ، و پیاویكی بەدیدەكرد كە بە دزەدزە و دوو چاوی سیخوڕییەوە بەرەولای دەهات ، و بەتیلەی چاویك لێی دەڕوانیت و كاتێك هەست دەكات سەرنجی ئەو دەدات ڕێگەكەی دەگۆڕیت ، و ونی دەكات و لە شوینیكی ترەوە دیتەوە ناو شەقامە فراوانەكە ، و قەرەباڵخی وەك زەریا لوشی دەدات ، و بە چاوە بەرزەكانیەوە بە شەقامەكەدا دەڕوات ، و چاودیری

خەڵکی دەکرد کە چەرخەلەیان دەکرد لە پیناو پاروە نان ، و شەمەندەفەرەکەش بە تایە خوارەکانیەوە هاواریتی لە بارگرانیدا . و لەسەر شۆستەکەش پیریکی نابینا دانیشتوە و دەستی درێژکردووە و دەپاریتەوە ، و منداڵانیش دەمە برسیەکانیان کردۆتەوەو چاوە زەردهەڵهاتوەکنیان لە چاوەرِوانی هەر پاروە نانیکدایە ، و لە پەنجەرەی شەمەندەفەرەکەشەوە سەرە لیکچووەکان و ملە پیچراوەکان بە بۆینباغ و چاوە نیشتووەکانیانەوە دەبینیت ، و لەژیر لیوەوە وتنەوەی ( ئایەت الکورسی و نەفاسات فی العقد ) یانە . و ناوبەناویش ئوتومبیلە درێژەکان کە وەك ئوتومبیلی پۆلیس وابوون دەبینران دەم و چاوە گۆشتن و ئەستورەکانی تیدابوون بە چاوە تەسك و پیکەوە نوساوەکان .

کاتێك تاریکی دادەهات بە هەنگاوە خێراکانیەوە دەگەڕایەوە ژوورە بچکۆلانەکەی ، و گویّی لە دەنگی هەناسە برِکیی بوو بە پچرِپچرِی ، و عەرەق ریچکەی دەکرد لە دەم و چاوی و جەستەی ، و دەرگاکە لە دوای خۆیەوە بە ئاسنیکی پتەو دادەخات ، و پەنجەرەکانیش ، و لەسەر جیگایەکی رەق و تەق درێژ دەبیت و سەرنج دەداتە تاریکایی . و روخسارو دەم و چاوە لاواز و بیهیزەکەی دیتەوە پێش چاو . هەروەها هەردوو چاوە ڕەشەکە بەلای شیندا کە توانای بینینیانی هەیە ، بە دەنگێکی نزمی شاراوە بانگی دەکات ( سلیم ! ) بەڵام هیچ کەسێک وەڵامی نیە . و دەزانیت کە خۆی بە تەنهایە هەڵدەسیت و پارچە کاغەزەکەی ژیر جیگەکەی دەردەهینیت ، و دەینیت بە دیوارەکەوە ، و پەنجەکانی دەئاڵینیت لە فلْچەکەوە و پەستانی دەخاتە سەر ، بەو پەستانە هەست بە چیژ وەرگرتن دەکات درێژ دەبیتەوە لە پەنجەکانیەوە بۆ قۆڵەکانی و بۆ شان و مل و گەردنی وەك وایەریکی کارەبا .

هەرکەس لەو کاتەدا بیبینیایە لەو تاریکاییەدا دانیشتووە سەری دەسورِما . ماسولکەکانی جەستەی پتەو وەك ئەوەی لەخاچ درابیت ، و چاوە جیگیرە ڕەشەکانی لەسەر هیڵەکانە ، و سەری لەسەر گەردنی جیگیرە ، و قۆڵەکانی جیگیرن ، و پەنجەکانی بە فلْچەکەوە توندو و جیگیرن ، و قاچەکانی جیگیرن وەك پەیکەریکی گرانیت .

چەندین لەم كاتانە بەم حاڵە بەرِیدەكات بێئەوەی كەس بزانیت . لەوانەیە شەو تیپەرِیت ئەو هەر دانیشتووە بیجوڵە ، بێئەوەی تەنها هێڵێك بخاتە سەر تابلۆكە ، بەڵام چاوەكانی هەر لەسەر هێڵەكانیتی ، و جارێكی تر دەژییەتەوە ، و ئاگاداری ساتەكانی تەمەنیتی سات لە دوای سات بەبەردەمیدا دەرِوات ، وەك شریتیكی سینەمایی .
لە نزیكی بەرەبەیاندا ، دەستی بە فڵچەكەوە درێژ دەبیت ، و بەسەر تابلۆكەدا دەیجوڵێنیت ، و هێڵەكان دەگۆرِیت و ساتوەختی نوی بۆ ژیانی دەكێشیت ، چەند ساتیكی نوی ئەو بە ویستی خۆی دروستیان دەكات ، بەو جوڵە خۆنەویستانەیەی سەر تابلۆ كاغەزەكە ، و بۆ هەر ئاراستەیەك و سەرجەم ئاراستەكان ، جوڵەیەكی ئازادانەی پتەو ، و پێی سەرجەم ویستەكانی تر دەشكێنیت ، و خودی خۆی هێڵەكانی ژیانی دروست دەكات ، و شێوازەكانی ، و رەشایی لە چاوەكانیدا زیاتر دەكات ، و لوتیشی زیاتر تیژ و بەرز ، و لیوەكانیشی جووت لە سوربوون و تورەییدا .
كاتێك هەست بە هیلاكی دەكات ، جەستەی ئازاد دەكات بكەویت ، و درێژ دەبیت لەسەر جیگا رەقەكەی . و لەسەرمان هەڵدەلەرزیت لەژیر تاكە بەتانیە تەنكەكەوە ، رایدەكیشا بۆ سەر دەم و چاوی و دەیئالاند لە هەردوو قاچە تەزیوەكەیەوە ، و دانە چرِكەی بوو وەك جیوەجیوی پاساریەكی تازە لە دایكبوو كەوتبیتە خوارەوە بۆسەر زەوی و چاوە هەتیوانەییكەی پرِ فرمێسكە لە تاریكاییەكی سامناكدا .
فرمێسكی گەرم لە قلینچكەی چاویەوە هاتە خوارەوە بۆسەر سەرینەكەی ، و هەستی بە شیی گەرم كرد لە ژیر رومەتیدا و سەری لەژیر بەتانیەكەوە دەرهێنا تا دایكی ببینیت ، دەمو وچاویكی درێژی باریك وەك دەم و چاوی خۆی ، و دوو چاوە فراوانە رەشەكەی ، و سنگە گەرمەكەی ، . سەری خستە قولایی سنگی دایكیەوە و بۆنی هەڵمژی ، و لە جەستەیدا بۆ جیگایەكی بەتاڵ دەگەرِیت تا لە ئامێزی بگریت ، و تیایدا سرِ ببیت دوور لە جیهان ، دوور لە هەموو ئەو هیزانەی خۆیان بۆ مەڵاسداوە ن وەك كۆرپەیەكی ساوا خەفە بیت ، ، و هەستیكی سەیر بۆ سۆزیكی ئارام جەستەی داگرت ، سۆزیك بۆ خۆپێچانەوە

لەناو ڕەحمدا . لەناو ئارامیدا ، لەناو بێدەنگیدا بەبی دەنگ و بی جوڵە ، . و قۆڵەکانی دایکی بەهێزیکی سەیر تیوەی ئاڵا ، بۆخۆیی ڕادەکێشێت جارێکی تر ، بەهەموو تواناى هەوڵدەدات کە ببنە یەك جەستە ، بەڵام بەبی هودە ، لەبەرئەوەی جیابوونەوەی بۆ هەتایی لە ساتوەختیکدا روویداوە و تیپەڕیوە و ناگەڕیتەوە .

بهیە ! ئەو دەنگە هاتە گوێی چاوەکانی کردەوە . کەسی نەبینی ، و تیشکی خۆرەکە لە بەشیکی داخوراوی شیشی پەنجەرەکەوە هاتۆتە ژوورەوە . و ڕێگا خاوەکانی بەیانیانی بینی لە پشتی دەرگاکەوە ، و پیاوە پیرەکەی بە عەمامەکەیەوە و دوو چاوی لاواز و کزەوە کە ڕەشاییەکانی لە سپینەکانیدا توابوونەوە بینی ، و پەنجە زبرەکانی ئاڵابووە تەزبیحە زەردەکەی دەستی ، و بەخێرایی و بەردەوامی مورووەکانی هەڵدەسوڕاند ، بسم الله و الله الله ، و چەندین وشەی تری یەك لە دوای یەك دەڵێتەوە کە تەناها پیتی ( س ) کەی دەبیسترا ئەویش کاتێک کە درێژی دەکردەوە .

کاتێک بینی لیوە وشك هەڵهاتووەکانی کرانەوە و ددانە زەردە داخوراوەکانی دەرکەوتن و بە دەنگێکی گیراوەوە وەك دەنگی ماریکی نوستوو وتی ( هەستایت ؟ ) .

بەدەنگێکی بیزارییەوە وەڵامیدایەوە و وتی : نەخێر . و دەرگاکەی داخستەوە . گوێی لە دەنگی هەناسەکانی بوو لەودیو دەرگاکەوە ، نێرینەیەکی بەساڵاچوو کە دوکەڵ سنگی بریوە ، و تەمەنی لە ناوجیگای چوار ئافرەتی سارددا بەسەر بردووە و لەهەر یەکێکیان کۆمەڵێك کوڕ و کچی بووە ، هەندێکیان مردوون و هەندێکی تریان ژنیان هێناوە و شوویان کردووە ، و لە ژنەکانی تەنها یەکێکیانی ماوە خۆی بە دیوارەکانەوە دەگریت ، و چای ڕەشی بۆ لیدەنیت ، و لە ئیوارانیشدا نیرگەلەکەی بۆ ئامادە دەکات ، و لەسەر جیگا تەختە شکاوەکەش لە تەنیشتیەوە رادەکشیت ، و پەنجە زبرەکانی دەکات بەنیو مەمکە شۆڕەکانیدا و هەناسەکانیان تیکەڵ دەبیت و کەمێک لەرینەوە دروست دەبیت و پاش کەمێک وەك دوو جەستەی گیان تیادا نەماو ئارام و بی جوڵە دەکەون لەسەر جیکا تەختە کۆنەکە . کاغەزەکە دەپیچیتەوە و جەستە درێژەکەی لە دەرگاکەوە دینیتە دەرەوە ، و بە گەڕەکەکەدا دەڕوات ، پێی لەدوا ی یەکتری دادەنیت ، و قاچەکان بە

شیوەیەکی بەرچاو لە یەکتری دوور دەخرینەوە ، و چاوەکانی پیاوانی گەرِەك لە دوکانەکانەوە سەرنجی دەدەن ، و چاوی ئافرەتەکانیش لە درزی پەنجەرە و دەرگاکانەوە . ئەمە پیاوە یان ژن ؟ گەر ئەو دوو مەمکە بچکۆلانەیە نەبوایە لەژیر بلوسەکەیەوە سویندیان دەخوارد کە پیاوە . و لەبەرئەوەی ئافرەتیشە ئەوا سەرنجدانی ڕێگە پیدراوە ، و وایلیهات جەستەی بووە خۆراکی چاوە برسیەکان ، سەیر ئەکەن ، چپەچپ دەکەن ، و یەکێکیان بە دەنگی بەرز پیدەکەنیت ، و یەکێکی تریان توانجیکی ناشرین دەهاویژیت ، و منداڵانی گەرِەك دوای دەکەون ، و کورِەکانیان کۆئەندامەکانیان پێشان دەدەن ، و یەکێك لە دواوە بەردیکی تیدەگریت ، و یەکێکی تر فیکەیەکی دورودرێژ لیدەدات ، پیاوە بەساڵاچووەکانیان کە لە چایخانەکاندا دانیشتوون دەستە زبرەکانیان دەدەن بە رانیاندا وەك زەوی قڵیشا و تینو بۆ ئاو ، و ئافرەتەکانیش لەودیوی دەرگاکانەوە ئەکیشن بە سنگ و بەرۆکە شۆرِەکانیان و بەدەنگە خەفەکراوەکانیانەوە دەڵین : برِواننە ئەم بیانیە !.

بەردەوام دەبیت لە ڕۆیشتنی و چاوەکانی بۆ پێشەوە بەنیو ئەو هەموو توانج و ژاوەژاوەدا ، ولیوەکانی جووت و توند دەکات لە تورِیی و بەڕەنگاربوونەوەی قەدەردا . و کاتێکیش جەستەی لە شەقامە فراوانەکەدا ون دەبیت دۆخی گەرِەکەکە ئاسایی دەبیتەوە ، و دەنگی ئاسن لە دوکانی ئاسنگەرەکەوە بەرز دەبیتەوە ، و تەقەی پیاڵە و تاوڵەش لە چایخانەکانەوە ، و گریان و هاواری منداڵان و شاتەشاتی ژنان لە پشت درز و کەلینی دەرگاکانەوە ، و دەنگی گرِی پیاوان بە خواردنی سویندو سی بەسی تەڵاق فرِیدان ، و بۆن و بەرامی فەلافل و ماسی سورەوەکراو بەرز دەبیتەوە ، و دەنکەکانی تەزبیحەکەی دەستی پیرەکەش لە سەماکردندان ، و بەرماڵەکە لەبەردەم پەنجەرەکەدا رادەخات ، و کاتیک کە رکوع دەکات و جەستەی بەر زبری بەرماڵەکە دەکەویت حەزیکی خەفەکراو لە جەستەیدا دەژیتەوە ، و چاوەکانی دەبرِیتە ناو گەرِەکەکە بۆ گەڕان بۆ هەر جەستەیەکی پیچراوە.

کاتێک تیکەڵ بوو بە شەقامە فراوانەکە هەوایەکی سارد لەسەر روومەتەکانیدا ، و پێستی دەم وچاوی چوەوە یەك و ئەو هەستە سەرتاپای جەستەی داگرت و بە

نزیكبوونەوەی لە مەترسی . سەیریكی ئەو پۆلیسەی كرد كە وەستابوو وپاشان چووە دوكانیكی بچكۆلانەوە ، و تابلۆكەی لە بەرگەكەی كردەوە ، و پیرەكە پیكەنی وەك هەموو جارێک كە تابلۆكانی دەبینی ، و دەستیكرد بە گیرفانیدا وەك هەمیشە و سی جونەیهی دەرهێنا یەكە یەكە بژاردی ، و كردیە دەستیەوە و ئەویش یەكەیەكە بژاردیەوە .
چووە دەرەوە بۆ شەقامەكە ، و دەستبەجی هەستیكرد كە دوو چاو چاودیری دەكەن ، و دوو قاچ بە دوایەوەن . بۆنی ئیشی هەویر هاتە لوتی ، و چووە ژوورەوە و پارچەیەكی لەو كیكە خوارد كە حەزی لێدەكات . و لەبەردەم خاوەن دوكانەكە وەستا تا پارەی كیكەكە بدات لە ئاوینەكەی بەرامبەریەوە وینەی ئەو دوو چاوە بچوكەی بینی كە بە دواوەیەتی . چووە شەقامەكە . دەستی جولاند تا تەكسیەك بانگ بكات كاتژمیرەكەی سەر مەچەكی بینی . تەكسیەك لەبەردەمیدا وەستاو سواربوو . لە پیچیكی شەقامەكەدا لایكردەوە بینی دوو چاوە بچوكەكە بە دواوەیەتی لە تەكسیەكدا . لە گۆرِەپانی ( عەتەبە ) دابەزی دەیزانی كە هەریەك لە فوزی و رەئوف لەو ژیرخانەدا چاوەرِوانی دەكەن ، بەڵام نەچوو . بەردەوام بوو لە سورِانەوە لە شەقامی ( موسكی ) و سەرنجی ئەو ژن و كچانەی دەدا كە بە قاچە پیكەوە لكاوەكانیان دین و دەچن ، و جەستە گەورەكانیان دەلەریتەوە لەژیر جلوبەرگە بریسكەدارەكانیان ، و سەرقاڵی كرِینی بۆدرە و ماكیاج و زەیت و جلوبەرگی رووتی خەو و پاپوجن ، و دەنگیان و بنیشتەكانی ناو دەمیان تریقەی دیت لە دوكانەكانەوە .
بهیە لیوەكانی لە تورِەییدا كرۆشت ، چونكە حەزی سەرفكردنی پارەو پول بەڵگەی قەرەبووی خەفەكردنی هەتاییە ، و ئەو چاوانەی بە كل ریژراون و نێرینەكان رادەكیشن لە بنەوەی ساردییەكی وەك بەستەڵەك هەیە ، و ئەو هەستە بە شەپۆلەی وەك حەریرە ژیرەوەی مێشكی كەرویشكیكی لەخۆ گرتووە تەنها خواردن و خستنەوەی جۆر تێگەیشتووە لە ژیان .
كاتێک كە خۆر خەریكبوو ئاوا دەبوو لە شەقامە فراوانەكە هاتە دەرەوە . ئاسمان و زەوی و دارودرەخت تا بیت رِەنگیان سور هەڵدەگەرِیت و رِەنگیان پی نامینیت وەك چۆن دەم و چاویك خوێن لەدەست بدات لە كاتی مردنیكی

لەسەرخۆدا . پاشان گڵۆپەکانی شەقامەکە داگیرسینران ، و چەندین و چەندین تیشکی گڵۆپەکان شکینرانەوە سەر چیمەنتۆکان و شوشە و پەنجەرەی دوکانەکان و روخساری خەڵکەکە ، و هەموو شتێک بریسکەی دەدایەوە لە تیشکە سپیەکاندا ، گوێی لە پێکەنینێکی ناسك بوو بینی کچیك قۆڵی کردووە بە قۆڵی کورێکدا ، و قۆڵەکەی تری تیوە ئاڵاندووە . خەندەیەکی بۆ کردن و هەستیکی چالاکانەی کتوپڕ بە جەستەیدا هات ، و سنگی پڕکرد لە هەوای شیداری شەو ، و هەردوو چاوە ڕەشەکەی وەك جووتیك ئەڵماس بریسکەیدایەوە ، وەك منداڵان سەرنجی ئەو روناکیانە دەدات کە بە دوکانەکاندا وەك میزڵدانی ڕەنگاوڕەنگ هەڵواسراون .

گوێی لە دەنگی پێکەنینی خۆی بوو دەنگیدەدایەوە وەك چۆن لە منداڵیدا گوێی لی دەبوو ، خەریك بوو وەك منداڵان باز بدات بەسەر زەویدا ، بەڵام دووچاوە بچکۆلانەکەی لەبەردومیدا بینی . لایکردەوە بینی دوو چاوی تر چاودیری دەکەن ، ویستی بڕوات بۆلای ڕاستی شەقامەکە دووچاوەکە هاتنە سەر ڕێگەی ، بەخێرایی بەرەو گەڕەکەکە کەوتەری لە تاریکیەکەدا پۆلیسە قەڵەوەکەی بینی قۆپچەی جلەکانی بریسکەی دەدایەوە و چەکەکەی شۆڕ ببوەوە بە پشتینە چەرمەکەیدا .

وەستا . و ئاوڕیکی خێرای دایەوە بەچواردەوری خۆیدا . بە جوڵەیەك کاتێک کە مرۆڤ هەڕەشە لیکراو دەبیت ، و هیزە دیار و ناسراوەکان لەبۆسەدان بۆی ، و چاوەڕوانی فرسەتن تا پیوەی بدەن . ئەو جوڵە خێرایە لە چاوەکاندا ، لە هەموو ئاڕاستەکانەوە ، بەشوین ئەو دەستەدا دەگەڕیت کە دەوەشینریت لە پشتەوە یان لە پێشەوە یا لای ڕاستەوە یا چەپ ، سەرجەم خانەکان لەسەردا دەجوڵیت ، بیر دەکاتەوە ، چۆن مرۆڤ رزگاری بیت لەو مەترسیەی خۆی بۆ مەڵاسداوە ، چۆن جەستەی لە بەرکەوتن و وەشاندن بپاریزیت ، و بە ئاگاوە بۆ دووری هەڵگریت ، ئەو هاتنەوە یەکە بەئاگایە لە ماسولکەکاندا ، و ئەو لیدانە دوودڵە لە سنگدا ، هاتن و چوونی خوێن بۆسەر و خوار ، ئەو جوڵە بەردەوامە دیاریکراوە ، لیدانی دوودڵی ، لەگەڵیدا لیدانی هەستکردن بە ژیان و پەنجە درێژەکانی هەڵدەلەرزین ، هەڵلەرزینیکی خێرای نەبینراو ، و قاچەکانی جیگیرن لەسەر زەوی ، و

جەستەی ریکە ، وەك جیگیری زەوی لەژیر پێیدا ، بەڵام لەژیر ئەم جیگیریەوە جوڵەیەکی خێرای هەست پێکراو هەیە ، وەك لەرینەوەی هەوا لە گویچکەدا ، و لەرینەوەی خوێن لەناو خوێنبەرەکاندا ، لەرینەوەیەکی خێرا لە دەرەوە وادیارە بێدەنگە ، بەڵام لەژیر ئەم بێدەنگیەوە جوڵەیەکی بەهیزی ترسناکی هەیە ، جوڵەی ململانی لە پیناو بەرگری و خۆبەدەستەوەدان ، تەنها جوڵە کە مرۆڤ هەست بە جیاوازی دەکات لە نیوان ژیانی و مردنی.

لیوەکانی کرانەوە بۆ خەندە کردن ، و چاوەکانی بریسکەیاندایەوە ، لەبەرئەوەی ئەم ساتە ئامانجیتی ، و هەر لە سەرەتاوە ویستویەتی ، و بە سووربوون و دڵنیاییەوە بەرەولای چووە ، ئەزانیت کە بەرەو مەترسی دەچیت ، ئەو ماوە بچوکەی هیندەی ساتیکە ، و هەڵواسراوە لە فەزادا ، و لە سەرەوەی ئاسمانە و خواریشەوە گیژاوی تیاچوون ، و تیایدا مرۆڤ ڕاپێچدەکریت لە نیوان دوو هیزی گەورەدا ، هیزیك ڕایدەکێشێت بۆ کەوتنە قوڵایی ، و هیزیکیش ڕایدەکێشێت بۆ هڵکشان بەرەو ئاسمان .

بە دڵنیایەوە دەیزانی کە ناکەویتە ناخی قوڵایی . خۆی بەدەستەوە نادات . نابیتە بهیە شاهین ، و ناگەرِیتەوە بۆ روخسار و دەم و چاوە ئاساییەکان ، و نوقم نابیت لە دەریای جەستە لیکچووەکاندا و یان بکەویتە گۆرِی ڕۆژگاری ئاسایی .

چاوە ڕەشەکانی بەرزکردەوە ، و ماسولکەکانی قاچەکانی وپشتی ریککردەوە ، و بەرەو لایان بە هەنگاوە فراوانەکانیەوە چوو ، و هەر قاچەی بە جیا لە زەوی دەدات ، و قاچەکانی ئازادانە لیك جیادەکاتەوە . کاتێک گەیشتە بەرامبەریان رووبەروو بە دەنگە پرِ متمانە و هێمنەکەیەوە وتی :

- با برِۆین .

یەکێکیان لێی هاتە پێشەوە ، و ئاسنیکی کردە مەچەکی و بە کلیلیك دایخست و کلیلەکەی خستە گیرفانی . لەپێشیانەوە بە هەنگاوی خێرا دەرۆیشت ، وچاوەکانی پێش قاچەکانی کەوتوون و لەنیو روخسارو دەم و چاوەکاندا ویڵە بەشوین روخساریکی لاوازی سست هەڵگری پەژارەی خەڵکی ، و ئەو دووچاوەی توانای دۆزینەوەی هەیە لەنیوان روخسارەکانی ترداو دەستنیشانکردنی جەستەی لەنیوان ملیۆنان جەستەی مەلە کردووی کەوندا .

کاتێکیش لەبەردەمیدا بینی وەك شادی و بەختەوەری منداڵان هاواریکرد :

- سلیم !.

قۆڵەکانی درێژکرد تا تیوەی ئاڵێت ، بەڵام قۆڵەکانی درێژ نەبوون ، و دەستەکانی لە عەڵقە ئاسنینە داخراوەکەدا هەژا ...

PDF 4 KURD

